بەرەو راستکردنەوەی
مێژووی سیاسیمان
(٣)

# هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعیراقی عەرەبییەوە



نوسینی :
سەلام ناوخۆش

چاپی یەکەم
١٤٢١ - ٢٠٠٠

بەرەو راستکردنەوەی مێژووی سیاسیمان
(٣)

# هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقی عەرەبی یەوە

نووسینی
سەلام ناوخۆش

کوردستان
٢٠٠٠-١٤٢٠
چاپی یەکەم

# هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقی عەرەبی یەوە

* نووسینی: سەلام ناوخۆش
* دەرهێنانی هونەری و کومپیوتەر: محەمەد مەلا حەمدی.
* چاپخانەی ژیان / هەولێر ۲۰۰۰.

# پێشەکی

ئەم کۆمەڵە نوسینە، ئەگەر لە ماوەی جیاجیاش نوسراون، بەڵام هەر هەموویان لە سەر یەک تەوەرە دەخولێنەوە ئەویش مەسەلەی داگیرکردنی کوردستانە. ئەو داگیرکردنە سەرەتا، بە غەزوێکی فکری و رۆشنبیری و کەلتوری دەستی پێ کردووە لە پاشان رۆژئاوا لە پێناوی بەرژەوەندیەکانی لە رۆژهەڵاتی ناوەراست دا هەوڵی داوە ملمـلانێ ی کـۆنی رۆژهەڵاتی ئیسلامی و رۆژئاوای نەسرانی لە رۆژهەڵاتی چڕ بکاتەوە بەواتای رۆژئاوا توانی کـۆمـەڵێ لە چەند نەتەوەیێ لە رۆژهەڵات هەڵبـژێری بۆ ئەوەی لە جیـاتی رۆژئاوا شـەڕی دین و کـەلتـور و حـەزارەتی رۆژهەڵات بکەن. ئەو سیاسەتەی رۆژئاوا هەر لە بەرای سەدەی نۆزدەدا لە ناوچەکەدا جێ پێ ی خۆی کردۆتەوە. لە پاش نانەوەی ملمـلانێ لە نێـوان گـەلانی ناوچەکـە بە تایبـەتی دوای دروست کـردنی بیـرۆکـەی گـەلی سـەردەسـتـەوە گـەلی ژێر دەستە، مەسەلەکە زێتر بەبەرژەوەندی رۆژئاوا تەواو بوو، لەو نێوە ئەگەر کورد لە هەمـوو مـیللەتێکی تر زیاتر باجی داگـیرکردنی دا، بەڵام وەنەبێ گەلانی تریش وەک عەرەب یان تورک حەساوە و سەربەست بووبن، بەڵکو

هەربۆ نموونە رۆژئاوا لە بریتی دروست کردنی «ئەمپراتۆریەتی عەرەبی» -وەک کە بەڵێنیان بەسەرکردە عەرەبەکان دابوو، ئەوا چەندەها حکومەتی عەرەبی دروست کرد و لە نێوان هەر حکومەتە کێشەیەکی سنووری خوڵقاند، هەندێ لەسەر کردە عەرەبە گوێ رایەڵەکانی رۆژئاوا لە بریتی ئەوەی لە هۆکارەکانی بەربەستی یەکێتی عەرەبی بکۆڵنەوە، ئەوا بوونی کورد و نەتەوە غەیرە عەرەبەکانی تر بەبەربەستی سەرکی یەکێتی عەرەبی دادەنێن. ئەمەو داگیرکارانی تورکی، عەرەبی، فارسی بە ئاراستەی رۆژئاوا و رۆژهەڵات هەمو هەوڵێکیان دا کە نەک هەر دەوری حەزاری کورد لە حەزارەتەکانی ئەو گەلاندا بەرپێ بخەن، بەڵکو کەوتنە هەرەشە لە بوونی کورد لە وڵاتی خۆیدا.

ئەم نووسینە لەشەش بەش پێکهاتووە. لە بەشی یەکەمدا کە تەنیا پێشەکی یەکم بۆبابەتەکە نووسیوە، ئەگەر نا نووسینەکە دەیڤد ماکدۆل لە بارەی هەرەسی میرنشینی سۆران نووسیویەتی. لەم نووسینەدا ماکدۆل، ئاراستەوخۆ، ئەو راستی یە دەخاتە روو کە مەلای خەتێ هیچ فەتوایەکی نەداوە بۆ ئەوەی میر موحەمەد خۆی بەدەستەوە بدات، بەڵکو ئەوەی ئەو دەوری بینیووە، ریچارد ودی بەریتانی بووە.

لەبەشی دووەمدا، هەوڵداوە لە هۆی ململانێ ی سولتانەکانی ئۆسمانی و میران کورد لە سەدەی نۆزدەهەمدا بکۆڵمەوە. بەرای نووسەر، رۆژئاوا دەوری سەرەکی بینیووە لە خولقاندنی ئەو ململانێ یەدا هەروەها پەشیمان بوونەوەی ئۆسمانی یەکان لە نیزامی لامەرکەزیەتی هەرێمە کوردی یەکان و پێکهاتەی خێڵەکی میرنشینە کوردەکان هە[illegible] بوون

بۆ رووخانی ئەو میرنشینانەو لە پاشان دەولەتی بۆسمانی! لە بەشی سێ یەمدا، لە بزاڤی مەشروتە خوازی ئیتیحادیەکانم کۆڵیوەتەوە هەروەها باسی دەوری کوردم کردووە لەو بزاڤەدا. لە بەشی چوارەمدا لە هۆکارەکانی لکاندنی باشووری کوردستانم بە عێراقی عەرەبی کۆڵیوەتەوە لەم بەشە جەختم لەسەر چەند هۆکارێکی نیو دەولەتی و هەرێمی و خودی کردوە کەهەر هەموویان وەک زنجیرەیەک بە یەکەوە پەیوەست بوونە و لە ئاکام ئەو بەشەی کوردستان لە ڕێگای کۆمەڵەی گەلان لە پاشان UN بۆتە بەشێکی (شەرعی) دەولەتی عێراق، لەبەشی پێنجەمدا -کە خۆی لە خۆیدا سەرباسێکی جیانەکراوەی بەشی چوارەمە- باسی کۆنگرەی قاهیرەم کردووە هەروەها باسی هەڵوێستی سەرانی ئینگلیزم لەو کۆنگرەیەدا لە بارەی چارەنووسی مەسەلەی کوردەوە کردووە.

لە دوابەشیش هەوڵم داوە بە کورتی لە کاریگەرەی داگیرکرن لە سەر کەسایەکی کورد بدویم. ئەوە ماوە بڵێم ئەوەیە کە ئەو نووسینانە هەربۆ زیاتر دەولەمەندکردنی کتێبی «کوردستان چۆن داگیرکراوە دابەشکرا» نووسراون بە تایبەتی بەشی سێ یەم کە تەنها هەندێ زانیاریم زێدەکردووە ئەگەر نا تەنها بەشی دووەمی کتێبی ناوبراوە.

سەلام

٢٠٠٠/١/١٥

# بەشی یەکەم

## لە جیاتی پێشەکی
## فەتواکەی مەلای خەتێ یا ڕیچار وەد؟

بێــجگە لە هەندێ نووســەری ئەکــادیمی و بەویژدان، ئەگــەرنا زۆر نووسەری کورد هەرەسی میرنشینی سۆران دەخەنە ئەستۆی مەلای خەتێ. هەموو بانگەشەکەشیان ئەوەیە گوایە مەلای خەتێ فەتوای داوە بەوەی ئەوەی شەری ئۆسمانی یەکان بکات ئەوا باوەڕی نامێنێ و تەلاقی دەکەوێ. ئێمە لەم کورتە نووسینەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەین کە هەرەسی میرنشینی سۆران هیچ پەیوەندی بە مەلای خەتێ وە نەبووە. بۆ سەلماندنی رایەکەشمان ئەوا بەکورتی ئەو راستی یانە دەخەینە ڕوو:

یەکەم: ئەوانەی داکۆکی لە میر موحەمەدیش دەکەن جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە میر زۆر توند و رەق بووە لە پێناوی دەسەڵاتی خۆی لە کوشتنی نزیکترین کەسی خۆیشی نەسەلەمیتەوە. فریزەر دەربارەی بێ رەحمی میر موحەمەد دەنووسێ: «لەشەڕی ئامێدی دا خێلێکی هەر لەبەر ئەوە قڕکرد، چونکە ئازایانە بەر هەڵستیان کرد» لەسەر ئەو بنەمایە، ئەگەر مەلای خەتێ بەقسەی رەشید پاشای ئۆسمانی فەتوای دابێ و سوپای سۆرانی لەشەڕ سارد کردبێتەوە چۆن مەلای خەتێ و یراوە لەرەواندز بمێنێ؟! دەبێ مەلای خەتێ لە باوک و مام و ئامۆزاکانی میر خۆشەویستر بووبێ؟!

دووەم: لەپاش هەرەسی میرنشینی میر موحەمەد، میر بەدەستی

ئۆسمانی یەکان کوژرا. لەپاش تیرۆرکردنی میر موحەمەد، مەلای خەتێ هەر لە ڕەواندز مایەوە. جا ئەگەر مەلای خەتێ فەتوای وای دەبێ -کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بۆتە لە نێوچوونی میر موحەمەد- دەبێ بۆچی برایەکانی میر موحەمەد تۆڵەیان لە مەلای خەتێ نەکردبێتەوە. مەلای خەتێ بەخۆی و بنەماڵەکەی هەر لەوێ بمێنێ و براکان و لایەنگران میر موحەمەد هیچی پێ نەڵێن؟!

سێ یەم: هەندێ دەیانەوێ «فەتواکەی» مەلای خەتێ والێک بدەنەوە کە مەلای خەتێ بۆ بەرژەوەندی میری سۆران ئەو «فەتوایەی» داوە هەروەها دەڵێن کە «ئیسلامەتی» پالی بە مەلا ناوە ئەو فەتوایە بدات. بەڵام ئەگەر بەوردی لەرەوشی دینی و سیاسی ئەوسا بکۆلینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو رایەش لەجێ ی خۆی نی یە، چونکە ئەگەر شەری نێوان سوپای سۆران و ئۆسمانی لە ئیسلام جائیز نەبێ؛ ئەوا شەری سوپای سۆران لەگەڵ سوپای ئامێدی و بۆتان و بابانیش جائێز نی یە. دەبێ مەلای خەتێ هەندە بێ ئاگابێ لە دین کە شەری ئۆسمانی و کورد بە حەرام بزانێ و شەری کورد-کورد بە حەلال بزانێ؟!

چوارەم: میر موحەمەد شەڕی ئیران و ئۆسمانی هەروەها شەڕی بابان و بۆتان وبادینانیش دەکرد، هەربۆیە نەک میرە کوردەکان بەهانای نەهاتن بەڵکو زۆریان پێ خۆش بوو کە میر تووشی ئەو چارەنووسەبێ. بەواتای مەسەلەی هەرەسی میرنشینی سۆران تەحصیلی حاصل بوو عەقڵ قەبوولی ناکات کە میرنشینێک بە فەتوایەک لە ناوبچێ ئەگەر گریمان هەندێ لەکەڵی شەیتان نەهاتنە خوارێ وتیان ئەوا ئەو میرنشینە بەو

فـەتوایە لەناوچووە. لێـرەدا دەپرسین ئەدی مـیـرنشـینی بۆتان، بادینان، بابان، ئەردەڵان بەفەتوای کام مەلا لەناو چوون؟!

پێنجەم: ئەم کورتە نووسینەی دەیڤد ماکدۆل کە لە لاپەرە ٤٢-٤٤ی کتێبەکەی «مێژووی نوێ ی کوردان» بەناوی «میر موحەممەدی رەواندز و هەرەسی میرنشینی سۆران بڵاوکراتیەوە تەواو ئەو رایانە پوچەڵ دەکاتەوە کە کەسێکی وەک مەلای خەتێ فەتوای وای دابێ. ماکدۆل لەم نووسینەدا، ئەوە دەخاتە ڕوو کە ریچارد و دی جاسوسی ئینگلیز لە ناوچەکەدا رۆڵی سەرەکی بینیوە لە قەناعەت پێ هێنانی میر موحەمەد کە تەسلیم بە سوپای ئۆسمانی ببێ. ئێمە ئەم رایەی ماکدۆل لەبەر ئەم دوو هۆیە سەرەکی یە بە پەسەند دەزانین:

یەکەم: ماکدۆل خۆی نووسەرێکی بیانی یە. بەقەولی خۆمان غەیرەدینە مەلای خەتێ-یش زانایەکی ینداربووە. ماکدۆل شارەزایەکی باشی لەبارەی مێژووی کوردان هەیە و دەشزانێ ئەو کێشەیە لەناوچەکەدا هەیە و گروپێ لەنووسەرانی کورد لەروانگەیەکی «نادینی» یەوە تاوانی روخانی میرنشینی سۆران دەدەنە پال زانایەکی دینی وەک مەلای خەتێ! لێرەدا مرۆڤ هەست دەکات کە ماکدۆل ئەکادیمیانە تر لەهەندێ نووسەری کورد لەمەسەلەکە دەڕوانێ و بە پاڵپشتی دۆکیۆمێنتەکانی ئەوسا، ناراستەوخۆ دان بەوە دەنێ کە ریچارد ود میرموحەمەدی رازی کردووە تەسلیم بە سوپای ئۆسمانی بێ نەک مەلای خەتێ!

دووەم: ئەوانەی لەسەر مەلای خەتێ یان نووسیوە هەموو رایەکانیان -بەبێ لێ وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە- لە کتێبی میرانی سۆران»

وەرگرتووە هیچ بیانییێ ئەو تاوانەی نەخستۆتە ئەستۆی مەلای خەتێ، چونکە ئەگەر شتی وا هەبوایە ئەوا رۆژهەڵاتناسەکان و مسۆنێرەکان نەک هەرباسیان دەکرد، بەڵکو زۆر گەورەشیان دەکرد بۆ ئەوەی ئاکامی خۆیان بپێکن!

هەر ئەو راستیانەبوون وایان لێ کردم ئەم کورتە نووسینەی ماکدۆل لە ئینگلیزی یەوە بکەمە کوردی.

# میر موحەممەدی ڕەواندز و هەرەسی میرنشینی سۆران

لەنێو دامەزرێنەرانی میرنشینی سۆران دا، میر موحەممەد لە پێشەنگی هەموویان بوو، کە هەم دل ڕەق و توندبێ، هەم ئارەزووی بێ کە سنووری دەسەڵاتی میرنشینەکەی فراوانتر بکات، لە ساڵی ١٨١٤ باوکی خۆی لەکار لابرد[١] لە پاشان دەسبەجێ نەیارەکانی خۆی لەنێو بازنەی سەرکردایەتی سۆران دا لەنێو بردن. کۆنە «خەزنەدار»ی باوکی یەکەم کەس بوو کە وەبەر ڕقی ئەو کەوت. لەپاشان هەردوو مامەکەی و کوڕەکانیان تووشی هەمان چارەنووس بوون. لەئاکام کەس لەنێو میرنشین نەما جورئەتی ئەوە بکات لەبەری قیت ببێتەوە، لەپاش زامن کردنی ڕەوشی ناوخۆی میرنشین، میر دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسا کە بەنیازێکی داگیرکارانە ڕوو بکاتە هاوسێکانی هێرشی کردنە سەر و ئەو خێڵانەی لە دەوروبەری میرنشینەکەی هەبوون یەک لەدوایەکی خستنە ژێر دەسەڵاتی خۆی. ئەو خێڵانەی وەبەر شالاوی میر کەوتن: خێلەکانی شێروان، برادۆست، سورچی، خۆشناو و مامش بوون. میر نەسلیمی یەوە لە کوشتنی ئەو سەرۆک خێڵانەی کە دیاربوو نەیاندەویست بێنە ژێر دەسەڵاتی وی. هەروەها میر شارۆچکەی نزیک بە میرنشینەکەی گرت، کە ئەویش شارۆچکەی هەریر بوو. ئەو شارۆچکەیە کۆنە پایتەختی سۆران بوو، بەڵام بۆ ماوەی نزیکەی نیو سەدە لە ژێر دەستی بابانیەکان بوو، بەگرتنی هەریر دووبارە ململانێ لەنێوان بابان و سۆران بوژیایەوە کە پێش

(١) باوکی میر کە ناوی مستەفا بوو، لە نزیکەی ساڵی ١٨١٠ ببوو بەمیری سۆران. لە پاشان لە ژیانی دوور لە سیاسەت ژیاوە تا ساڵی ١٨٢٦ کۆچی دوایی کردووە.

چەند ساڵێک باوکی میر کۆتایی بەو ململانێ یە هێنابوو. ئەمە و میر دەستی بەسەر ئەو ناوچەیەش داگرت کەسنور درابوو بە هەردوو زابەوە، دجلە و سنوری ئێران. لە ساڵی ١٨٢٣ شارۆچکەیەکی تری بابانی یەکانی گرت کە ئەویش شارۆچکەی کۆیە بوو هەروەها بە گرتنی هەولێر و پردێ -ئالتون کوپری- توانی دەسەڵاتی خۆی بکەیەنەتە سنوری دەشتی میزۆبۆتامیا. ساڵی ئاینده توانی ڕانیەش بگرێ کە دەکەوێتە نێوان ناوچەیەکی چیایی یەوە.

ئامانجی ئایندەی میر میرنشینی بادینان بوو، میر سەعید ئامێدی ناسرابوو بەوەی کە میرێکی لاواز و بێ دەسەڵاتە. لە ساڵی ١٨٣١ داسنی (شێخانی یە) یەزیدی یەکان سەرۆکی خێلی مزووریان کوشت بوو. کوشتنی (عەلی ئاغای) باڵەتەی گەورەی مزووریان، و بێ دەنگ بونی میر سەعیدی ئامێدی بۆ سزادانی یەزیدی یەکان وای لە میر کرد کە ئەو مەسەلەیە بکاتە بەهانەیەک بۆ گرتنی میرنشینی بادینان.

لەئاکام میر بەڵێنی بەخۆی دا کە گوندەکانی شێخان، کە دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی موسڵ وێران بکات. میر کۆمەڵکوژی یەزیدی یەکانی کرد هەزاران پیاو و ژن و منداڵی لێ کوشتن و هەروەها تەواوی کۆمەڵگای یەزیدی لەوێ ڕاپێچ کردن. ئەوەی ڕزگاری بوو، کە ژمارەیەکی کەم بوون، بەرەو باکوری تورعابدین، کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ماردین یان بۆ (جبل سنجار) کە دەکەوێنە ڕۆژئاوای موسڵ، هەڵاتن، کوشتنی ئەو ژمارە زۆرەی یەزیدی یەکان بێجگە لەمەسەلەی تۆڵەسەندنەوە لەسەر چەند شەنگستەیەک پاساوی بۆ هێنرایەوە. داسنی یەکان دوژمنداریەکی کۆنیان دەگەڵ سۆران هەبوو. ئەوان لەهەندێ دەرفەتی پێشوو دەسەڵاتی

گەورەکانیان لە میرانی ئامێدی ڕەتکردۆتەوە. داسنی یەکان و هاودینەکانیان لە (جبل سنجار) چەند جارێ هێرشیان کردۆتە سەر گوندەکانی دەشتی موسڵ تا لە ئاکام لەبەرامبەردا ئوسمانی یەکان لە ماوەی سالآنی ١٧٦٧-١٨٠٩ چەندان جار هێرشی سەربازی یان کردونەتە سەر. هەر لەو ساوە، بوونی یەزیدیەکان ترسی دروست دەکرد، ئەو جارەش بەکوشتنی گەورەی مزووری یان سەلماندیان کە مەیلێکی ترسناکیان هەیە. وێرای هەموو ئەمانەش بە حوکمی ئەوەی یەزیدی یەکان هەرتەقی «کافر» بوون، بۆیە ببونە هەنجەتێکی مەنتیقی کە لەلایەن میرەوە لێ بدرێن پاش ئەوەی دەرکەوت کە میر سەعید ناتوانێ بە ئەرکی خۆی وەک دەسەلآتێکی بە دەسەلآت رابێ و تۆڵەی مزووریەکان بکاتەوە. بۆیە میر سالی ١٨٣٣ شارۆچکەی ئاکرێ ی گرت و حاکمەکەی لادا. میر لەپێشرەوی خۆی بەردەوام بوو تا لە پاش گەمارۆدانێکی کورت توانی ئامێدی بگرێ. میر سەعیدی دەرپەراند. و گوێ ڕایەڵێکی بادینی لە شوێنی ئەو دانا. هەروەها زاخۆ و دهۆکیشی گرت ئەو دوو شارۆچکەیە هەر بۆ بازرگانی گرنگ نەبوون، بەلکو چونکە هەردوو دەکەونە نێوان موسڵ و جەزیرەوە (جزیرە بن عمر) ئەو شوێنەش شوێنێکی ستراتیژی بوو. وەنەبێ دەسەلآتدارانی ئوسمانی بێ ئاگابووبن لەو کارانەی میر، بەلآم هێزێکی ناوخۆی ئەو تۆیان لەبەردەست نەبوو بۆ ئەوەی مامەڵە دەگەل میر موحەممەد بکەن ئەوان تەواو مژۆل بوون بە ئیبراهیم پاشاوە، چونکە ئیبراهیم پاشا سوریای گرت بوو خەریک بوو ئەنادۆلیشی داگیردەکرد هەروەها ئوسمانی یەکان دەترسان کە میر موحەممەد بەکردەوە

پەیوەندی دەگەڵ هێزەکانی مصر هەبێ.

هەرچەندە میر موحەممەد میرێکی بێ ڕەحم و دڕ بوو، بەڵام ناتوانرێ نکۆڵی ئەوەش بکرێ کە پاش ئەوەی هێرشەکانی بۆ تەمبێ کردنی نەیارەکانی بەرەو داسەکاندن دەچوون، جۆرێک لە ئارامی و ئاسایش لەناوچەکەدا بەر قەرار کردبوو کە پێشتر خەڵکەکانی ناوچەکە شتی وایان بەخۆووە نەبینی بوو. ئەمە وای لە والی بەغدا کرد کە لە شایلوغانێکدا دان بە دەسەڵاتی میر دابنێ و لەقەبی پاشای پێ بدات. لەئاکام، میر موحەممەد وەک بریکارێکی ئوسمانی لەناوچەکەدا یاسا و نیزامی بەسەر ئەو ناوچانەی ژێر دەسەلاتی خۆی دەسەپاند. هەروەک لەمیری کوردی چاوەڕێ دەکرا، شیمانەدەکرا، کە میر شێوازێکی سەرکەوتوو بدۆزێتەوە بۆ مامەلەکردن لەگەل ئەستەنبۆل.

لە ئەستەنبۆل زەنگەکانی نیگەرانی دەزرینگانەوە و دەبوو ئوسمانی یەکان هیچ دەرفەتێ بە فیرۆنەدەن و دەستبەجێ دەست بەکاربن، هەرچی میر موحەممەد بوو ئەوا بەرەو دجلە لە پێشرەوی دابوو لەدژی میرنشینی بۆتان تا توانی دەست بەسەر جەزیرەی -شوێنی میرانی بۆتان- بەدرخانیەکان (میری ئەزیزان) بگرێ و لەئاکام ترسێکی زۆری خستە دڵی خەلکی «حصن کییف»، «نصیبین» هەتا «ماردین»یش .لەکاتی پێشرەوی میر بۆ بۆتان ناچار بوو بەگەرمی بەرەو ئامێدی بگەڕێتەوە، چونکە میر سەعید دووبارە دەستی بەسەر ئامێدی داگرت بۆوە لەپاش تێکۆشانێکی ترسناک میر توانی دووبارە ئامێدی لە دەستی میر سەعید بسەنێتەوە. لەتۆڵەی ئەو شەڕەدا، میر زۆربەی دانیشتوانە سەرەکی یەکانی ئەو ناوچەیەی بەسەر شیرەوە کردن و بەشێوەیەکی

رەسمیش بادینانی لکاند بەرەواندزەوە و بەکردەوەش میرەکانی بەهدینانی لەنێو بردن[٢].

لە سالی ١٨٣٤ ڕەشید موحەممەد پاشا، سەرۆک وەزیرانی پێشووی ئوسمانی و حاکمی سیاسی ئەوسا، وەک بەرپرسی هێزێکی گەورەی ئوسمانی بەدەرکەوت، ئەرکی سەرەکی ڕەشید پاشا بریتی بوو لەنێو بردنی میرانی کورد. ئامانجی یەکەمی ڕەشید پاشا وەک پێش بینی دەکرا لەنێوبردنی میر موحەممەد بوو، کە لە هەموو ناوچەکان کشابۆوە خۆی لەشارۆچکەی عاصێ و قایمی رەواندوز -کە دەکەوێنە ناو جەرگەی سۆران- قایم کربوو. کاتی ڕەشید پاشا، هاتە هەرێمی سۆران لە گەروی رەواندوزەوە هێزەکانی والی بەغدا و موسل یش پێ ی گەیشتن. ڕەوشی خۆ بەدەستەوەدانی میر موحەممەد رووناکی یەکی گرنگی دەخستە سەر ڕەوشی سیاسی ناوخۆ. بۆ ئەوەی چیتر خوێن نەرژێ و پێشرەوی سوپای عوسمانی کارەساتی زیاتری لێ نەکەوێتەوە بە گوێرەی دابێ باوی خۆ بەدەستەوەدان[٣]، میر موحەممەد بە بەڵێنی ڕەشید پاشا دەسخەرۆ بوو. ڕەشید پاشا پەیمانی بە میر دابوو کە بەسەلامەتی تەسلیمی ئەستەنبولی بکات هەروەها لە پاش خۆ بە دەستەوەدان دووبارە بیکاتەوە میر لە میرنشینەکەی خۆی دا، بەڵام نامەکانی ریچارد ودی جاسوسی بەریتانی وا دەردەخەن کە تۆری پیلان چەنینێکی چڕتر و ئاڵۆزتری هەبووە (وەک لەوەی

(٢) چێگرەوەی میر سەعید، کە ناوی اسماعیل بوو بە ماوەیەکی کورت پاش هەرەسی میر موحەممەد گەڕاوە ئامێدی، بەڵام هەرزوو والی موصل لەسەر کاری لابرد، ئەویش لە ئاکامدا ڕاپەڕی بەڵام لەپاشان گیراو دوور خرایەوە.

(٣) بەراوردی جیا ڕایەکان، بکە چالیاند، بۆ نمونە، گەلی بێ نیشتمان، ل٢٩، جوادک، بزاڤی ناسیونالیستی کورد ل ١٧١-١٧٣، لۆنگریک، چوار سەدە، ل٢٨٦، محمد امین زکی، خلاصە-ل٢٣٢-٢٣٣.

پێشەوە ئاماژەی بۆ کراوە) مەسەلەکە (هەرەسی میرنشینی سۆران) راستەوخۆ پەیوەست بووە بەملمـلانێ ی زلهـێـزەکـان و دوژمنداری ئێـرەیی نێـوان دەسەلاتدارانی ئوسمانی (والی بەغدا و رەشید پاشا) و قاجاری یەکان، لە ساڵی ١٨٣٥ ریچارد ود، وەک دیپلوماتێکی گەنج لە ئەستەنبۆڵەوە بۆ سوریا نێـردرا بۆ ئەوەی بزانێ هیچ دەرفـەتێ دەرەخـسێ بۆ ئەوەی یاخی بونێکی سەرکەوتوو لەدژی سوپای مصری لەسوریای داگیرکراو بەرپا بکرێ و لە ئاکام بتـوانرێ دەسـەلاتی عـوسـمـانی بۆ ناوچەکە بهـێندرێـتەوە. لەپاشان ود خۆی گەیاندۆتە رەشـید پاشا (کە بەلەناوبردنی مـیر موحەممەد خەریک بوو). ئەو هەوڵەی ود بۆ ئەوەبووە کـە دڵنیـا بێ ئا خـۆ ئەو دەنگۆیەی لەبارەی دەست تێکەڵکردنی رەشـیـد پاشـا لەگەڵ مـصری یەکـان لە ئەسـتـەنبۆل بڵاوبـبـۆنەوە راستـە یان نەء. ود بەبێ بیـرکردنەوەیەکی قـووڵ بەئاشکرا رەشـیـد پاشـای بە خـیـانەت تۆمـەتبـار کـرد لەئاکـام ود ناچاربوو بەدزی خۆی ون بکا و بەشـەو لەخوارووی دیجلەوە خۆی بگەیەنەتە بەغدا. ود گەیشت بووە ئەو قەناعەتە کە ئەگـەر سـوپای ئۆسـمـانی یەکـان هەوڵ بدەن رەواندز بگرن ئەوا دوچاری شکانێکی حـەیابەر دەبن. ود لەبەغـدا لە (مـقـیم)ی کـۆمـپـانیـای هیندی رۆژهەڵاتی زەنێکی بەرگوێ کەوت بوو بەوەی روسەکـان خـەریکن لە تەهران قـاجارەکـان هان دەدەن کـە چاودێری گـۆرانکاریەکـانی سەرسنووربکەن. ود و جەنابی «مقیم» بەمە نارەحەت بوون، چونکە لە کاتێکدا بەریتـانیا خەریکی مـەشق پێ کـردنی سـوپای قـاجاری بوو کـەچی لەبەرامـبـەردا شـای ئیـران لە جیـاتی روسیـا کاری دەکرد و لەسنوری رۆژهەڵاتی ئەمبراتۆریەتی ئۆسمانی دا لە دژی بەرژەوەندی یەکانی بەریتـانیا جم و جۆلی دەکرد. ئەو رەوشە سیـاسی

یەی ئەوسا و بەرژەوەندی یەکانی بەریتانیا، وایان لە ود کرد بریاربدا کە عەلی رەزای والی بەغدا ببێنێ، هەربۆیە ود داوای بینینی عەلی رەزای کرد. عەلی رەزا خۆی شەخصی میر موحەممەد دەناسی. ود بەبێ کێشە توانی عەلی رەزا قەناعەت پێ بێنێ کە ئەگەر هێزەکانی ئوسمانی و سۆران رووبەرووی یەکتر ببنەوە لە رواندز ئەوا ترسی هەرەسی سوپای ئوسمانی یان هێزەکانی میر موحەممەد لەرەواندز شتێکی حەتمی دەبێ. بەواتای ود باوەری وا بوو کە لە نێوچونی سوپای ئوسمانی یان سۆران هەردووکیان لە بەرژەوەندی ئوسمانی دا نی یە، بۆیە ود باوەری وابوو -کە شەری هەردوو لا- بۆ شایی لەناوچەکە دەخولقێنێ و لەو رێگایەوە قاجارەکان، کە پێشتر سلیمانی و شارەزووریان داگیرکردبوو، دەتوانن بەرەو ناوچەکە پێشرەوی بکەن؛ جا بۆ ئەوەی قەلایەک لەبەردەم پێشرەوی قاجاری یەکان دروست بکرێ، ئەوا ود وای پێ باش بوو کە هێزەکانی ئوسمانی و میر موحەممەدی «تۆبەکار» پەشیمان بۆووە لەبەردەم قاجاری یەکان یەک بخرێن و قەلایەکی توندیان لێ پێک بهێنرێ. عەلی رەزای والی بەغداش، دەیەویست پلانەکەی رەشید پاشا هەرەس پێ بێنێ دەس پێشخەریەکە ببێ بە موڵکی خۆی[٤]؛ بۆیە ئەو پێشنیارەی ودی پەسەند کرد بەوەی ود گەشتێکی پر ترس بەرەو رواندز بکات بەو ئامانجەی بتوانێ بەخۆی میر موحەممەد قەناعەت پێ بێنێ کە تەسلیمی ئەستەنبۆل بێ.

زەحمەت بوو ود بتوانێ لەکارەکەی سەرکەوتووبێ، چونکە لە رواندز هەر تەنیا میر موحەممەدی نەبینی، بەڵکو بریکاری قاجاریش لەوێ بوو

(٤) عەلی رەزا پاشا پالنەرێکی تری هەبوو، رەشید پاشاو عەلی رەزا کەیفیان بە یەکتر نەدەهات، بۆیە عەلی رەزا پێشوازی لەو دەرفەتە کرد بۆ ئەوەی سەرکەوتنەکە بۆ ئەو بگەرێتەوە.

خەریکی دانوستان بوون لەبارەی ئەوەی میر موحەممەد بەرەو ئێران هەڵبێ، لەویش قاجاری یەکان پالپشتی دەکەن لە دژی سوپای ئوسمانی[٥]. ود دڵی بەوە خۆش بووە کە توانیویەتی بریکاری قاجار هەراسان بکات کە پێ ی وتوە کە چۆن ئێرانیش لەهەمان کاتدا پێشنیاری هاوکاری کردنی دەگەڵ تورکەکان کردووە بۆ هەرەس پێ هێنانی میر موحەممەد! ود ئاگاداری ئەو پێشنیارەی ئێران بووە، چونکە لە ئەستەنبۆل سەفارەتی بەریتانیا ئەو هەواڵەی پێ ڕاگەیاندبوو هەروەها ود توانیویەتی میر موحەممەد ئاگادار بکاتەوە بەوەی سوپای عەلی ڕەزا تەنیا چوار کاتژمێر بەپێ لە ڕەواندز دوورن. دیپلۆماسیەتی و دکاری خۆی کردووە، چونکە میر موحەممەد پاش ئەوەی لەو هەواڵانە ووردبۆتەوە هەروەها کە لەلایەن «ود»ەوە دڵنیا کراوە کە بە سەلامەتی دەیگەێننە ئەستەنبول، بە بەڵێنی عەلی ڕەزا هەڵخەتاوە، کە بەڵێنی دابوو دووبارە بیکەنەوە میر لەرواندز بۆ ئەوەی سنور لە پێشرەوی ئێران بپارێزێ. لەئاکام، میر موحەممەد بیرۆکەی هەڵاتن بەرەو ئێرانی ڕەتکردەوە و کە قاجاری یەکان بۆیان پێشنیار کردبوو، و ڕازی بوو کە خۆی بەدەستەوە بدات. هەرچەندە میر موحەممەد لەژێر چاودێری ڕەشید پاشا، نەک عەلی ڕەزا، بەرەو ئەستەنبۆل گەشتی کرد بەڵام ڕەشید پاشا بەو هیوایە بوو کە لە بەرەی جەنگدا میر موحەممەد لەنێو بەرێ، بۆیە بۆ ئەوەی ڕەشید پاشا دڵی ئاوبخواتەوە و بە ئاشکرا میر موحەممەد ریسوا

---

(٥) ئەم مەرجانە بەو ڕاستیانە ئالۆز دەبن چونکە لە ٢٠ ساڵی ڕابردوودا، میر موحەممەد شەڕی ڕاگەیاند لەدژی ناوچەی ژێر دەسەلاتی ئێران، میر هەر پێنج ساڵ پێشتر شارۆچکەی کۆیەی لەژێر دەسەڵاتی ئێران دەرهێنابوو لەبەرامبەر دا ئێران بەزانینی ئەو هۆیانە داوای بژاردنەوەی دەکرد.

بکات فەرمانی پێ کرد کە بەرەو ئەستەنبۆل گەشت بکات.

دوو پەراوێزی گرنگ هەن بۆ ئەم چیرۆکە (چیرۆکی خۆبەدەستەوەدانی میر موحەممەد بە بەڵێنی عەلی رەزا و دیپلۆماسیەتی ریچارد ود): یەکەم هێزی قاجاری کە لە سنور پەری بۆوە بۆ پالپشتی کردنی میر موحەممەد بەتالیونێکی پیادەی روسیشی لەگەڵ دابووە، کە ژمارەیان گەیشتۆتە ٨٠٠ کەس[٦] ئەمەش بەڵگەیەکی ترە سەبارەت بە پەرەسەندنی بەرژەوەندی یەکانی زلهێزەکان لە ناوچەکەدا، سەبارەت بە میر موحەممەد، ئەوا لەلایەن سولتانەوە بەرێز و شکۆوە پێشوازی لێ کراوە هەروەها شیمانەی ئەوەش دەکرێ کە بەڵێنی پێ درابێ کە هەموو کوردستان بەرێوە ببات، ئەمەش خەونی میر بوو، بەڵام ئەم رایە جێیێ ی گومانە. دووبارە بە میر کردنەوەی مرۆڤێکی وەک میر موحەممەد دەگەڵ کرۆکی ریفۆرمی سیاسەتی هەرێمایەتی ئوسمانی یەکان تێک ناکاتەوە و ناکۆکە، چونکە سولتانی عوسمانی دەیەویست لە بریتی دانانی میرە کۆنەکان چەند کەسانێک لەشوێنی ئەوان دابمەزرێنێ و لەژێر کۆنترۆلی ئەستەنبۆل دابن. هەر چۆنێ بێ ئەو راستی یە زانراوانەی هەن باشتر لە گەل ئەم بۆچوونە دەگونجێن، چونکە لەکاتی گەرانەوەی دا بۆ نیشتمان، میر موحەممەد بەئاسانی شوێن بزرکرا، راستر لەرێگای گەشتی دەریای لەئەستەنبۆلەوە بۆ تەرابزون کوژرا.

---

(٦) ئەوە لەوانەیە راکردووەکان بووبن، چونکە زۆر زەحمەتە باوەر بکەین کە ئەو ژمارە زۆرەی سەرباز بەبێ رازی برونی روسیا بۆ قاجاری یەکان بەکار هاتبن. لەریچارد و دەوە بۆ لۆرد پۆتسۆیی ١٨٣٦/٩/١٩، کونینگهام، نامەگۆرینەوەکانی بەرایی، ل١٠٩.

# بەشی دووەم

# هۆی ململانێی دەوڵەتی ئوسمانی و میرانی کورد لەسەدەی نۆزدەهەمدا

## پێشەکی

بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافی کوردستان، کوردەکان هەریەکە لەناوچەی خۆی میرنشینێکی دامەزراندووە، پێکهاتەی ئەو میرنشینانەش، بەگوێرەی دابی سەردەم و لەسەربنەمایەکی خێڵەکی دامەزراون، بەرژەوەندی میرو بەگ و ئاغاو شێخ لەسەرەوەی هەموو بەرژەوەندییەکان دابوونە، لەپاش شەڕی چاڵدێران لەڕێگای مەولانا ئیدریسی بدلیسی، پەنجاوپێنج میری کورد لەقەڵەمڕەوی کوردستانی عوسمانلیدا میرنشینی سەربەخۆیان هەبووە. ئەگەرچی لەپاش ئەو شەڕەش دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ دەوڵەتی ئێرانی سەفەوی کوردستانی دابەش کردووە، بەڵام نێوان میرانی کوردو دەوڵەتی عوسمانی تا بەرایی سەدەی نۆزدەهەم لەکاتی پچڕ پچڕ نەبێ، دەوڵەتی عوسمانی شەڕی ئەو میرانەی نەکردووە. لەپاش ئەوەی سوڵتان مەحموودی دووەم بڕیاریدا سیستەمی مەرکەزیەت بەسەر دەوڵەت بسەپێنێ و میرنشینەکان هەڵوەشێنێتەوە، بەرایی ململانێ دەستی پێکرد، لەم نووسینەدا جەخت لەسەر ئەوەکراوە کە ڕۆژئاوا

دەستێکی باڵای لەورووژاندنی ئەو مەسەلەیە هەبووە هەروەها پێکهاتەی هەریەک لەدەوڵەتی عوسمانی سەدەی نۆزدەهەم میرنشینە کوردییەکان هۆکاری گرنگ بوون بۆ ئەو ململانێیە کەلە ئاکامدا دەوڵەتی عوسمانی و میرنشینە کوردیەکانی لەنێوچوون!!.

**١- چارەنووسی مەسەلەی کورد لەنێوان بەرداشی عوسمانی و سەفەویدا..**

پێش شەڕی چاڵدێران (١٥١٤) هەریەک لەمیرانی کوردو فارس و عوسمانلی خاوەنی دەسەڵاتی خۆیان بوون. میران یکورد بەرلەو شەڕە چەند حکومەتێکی سەربەخۆیان نیمچە سەربەخۆیان دامەزراندبوو، وەک حکومەتی رەواوی (٢٣٠-٦٨٠هـ)، حکومەتی سالاری (٣٠٠-٤٢٠)، حکومەتی حەسنەوی (٣٣٠-٤٠٥) حکومەتی شەددادی (٣٤٠-٤٦٥)، دۆستەکی (٣٥٠-٤٧٦)، عەننازی (٣٨٠-٤٤٦)، شەبەنکاری (٤١٢-٦٥٨)، کوڕی گەورە (٥٥٠-٨٢٧)، لوڕی بچووک (٦١٧-١٢٨٤)، ئەردەڵان ٦١٧-١٢٨٤، مەلەکییەی گەورە (٦٤٣-٧٨٥)[١] هەرچی فارسەکانیش بوون پاش ململانێی «مأمون و ئەمین» هەر لەبەرایی سەدەی سێی کۆچی هەوڵیانداوە لەدەسەڵاتی عەرەب جیابنەوە، بەڵام هەر لەسەر مەزهەبی سوونني بمێننەوەو لەناوچەی خۆیان لەنێوان ساڵانی ٢٠٥ کۆچی تا ٣٨٩ چەند حکومەتێکی ئێرانی سوننە مەزهەبیان دامەزراندووە وە: «حکومەتی تاهری (٢٠٥-٢٥٩) حکومەتی سەفاری (٢٥٩-٢٧٩)، حکومەتی سامانی

---

**(١) گۆڤاری ئاڵای ئیسلام ژ (٢-٣) چاپی کوردستان ل١٠**

(٢٧٩-٣٨٩)[٢] سامانییەکان توانیان دەست بەسەر زۆر هەرێمی ستراتیژی دابگرن وەک «هەرێمی پشت زێ، خوراسان، سجستان، تبرستان، رێی، کرمان» هەر لەسەردەمی حکومەتی سامانیدا ململانێ لەنێوان تورک و دەوڵەتی سامانی روویدا لەئاکام تورکەکان توانیان دەوڵەتی سامانی بڕوخێنن[٣]. ئەمەو بەحوکمی ئەوەی دایکی موعتەسەم-ی کوڕی مەئمون تورک بووە، دەوڵەتی عەباسیش پشتی بەهێزی تورکان بەستووە. لەپاش سەردەمی سامانییەکانیش دەوڵەتی غەزنەوی (٣٨٩-٤٢٩) دەورێکی گرنگی هەبووە لەناوچەکەدا، بەڵام بەڕووخانی دەسەڵاتی غەزنەوی، سەلجوقییەکان توانیان لەساڵی ٤٢٩ی کۆچی دەوڵەتی سەلجوقی لەهەرێمی خوراسان دابمەزرێنن[٤]. لەپاش سەلجوقییەکانیش ٤٢٩-٥٩٠، دەوڵەتێک بەناری دەوڵەتی خوارزمی دامەزراوە، بەڵام لەساڵی ٥٩٩ مەغۆڵ توانی دەست بەسەر ئێران دابگرێ.

لەم ماوەیەدا هیچ ململانێیەکی ئایدیۆلۆژی یاخود مەزهەبی لەنێوان تورک و فارس لەئارادانەبووە، حکومەتەکانی کورد، فارس، تورک هەموویان پەیڕەوی ئایینزای سوونەیان کردووە، بەرایی کێشەکەش بۆ ساڵی ٩٠٦ی کۆچی دەگەڕێتەوە، دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی لەئێراندا- لەساڵی ٩٠٧ سەفەوییەکان ئاینزای «شیعەی ئیمامی»یان کردە مەزهەبی رەسمی دەوڵەت، زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان جەخت

(٢) مجلة السنة، العدد (٥٠) ص ٢٣
(٣) مجلة السنة، العدد (٥١) ص ٥٧
(٤) سەرچاوەی پێشوو.

لەسەر ئەوە دەکەن کە هۆی تێکچوونی پەیوەندی نێوان میرانی کوردو دەوڵەتی سەفەوی دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی پڕ هەڵەی شا ئیسماعیلی سەفەوی بەجۆرێک هەر لەساڵی ١٥٠٥ زایینی هێرشی کردۆتە سەر کوردستان[٥]، بەڵام میرانی کورد هەر بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی بۆ شا ئیسماعیل پیشان بدەن دوازدە لەمیرانی کورد دەچنە تەبرێز، بەڵام هەروەک بدلیسی دەنووسێ: میرانی کوردستان هەرکە گەیشتنە تەورێز، تەبرێز- بەفەرمانی شا هەموو لەکۆت و زنجیر دران و لەزیندان هاوێژران[٦] هەر لەوساڵەدا یازدە میری کوردی دیکە، دیسان بەرێکەوتن، چوون و گوێی بەفەرمانیی و پەیڕەوکردنی خۆیان لەشا راگەیێن، کەچی ئەمانیش هەر بەدەردی دوازدە میرەکەی دی چوون و چارەنووسیان لەچارەنووسی ئەوان زێتر نەبوو[٧].

رووداوەکانی ١٥٠٦و ١٥٠٧-١٥٠٨ پەیوەندی نێوان میرانی کوردو دەوڵەتی سەفەوی زۆر ناخۆشترکرد وادیاربوو دەوڵەتی سەفەوی تەنیا دەوڵەتێکی داگیرکار نەبوو، بەڵکو لەرووی مەزهەبییەوەش دەیویست غەزووی کورد بکات، لەبەردەم هەڕەشەی سەفەویدا میرانی کورد لەبەر دووهۆی سەرەکی مەیلیان بەلای عوسمانیەکان بزووا: یەکەم عوسمانییەکان لەگەڵ کورد هاومەزهەب هاوسنووربوون هەردووکیشیان دوژمنی سیاسەتی فراوانخوازی دەوڵەتی سەفەوی بوون، دووەم:

(٥) د. شەمسی ئەسکەندەر، مێژووی کورد لەسەدەی ١٦ هەمدا، وەرگێڕانی شوکور مستەفا، ل٦٧
(٦) سەرچاوەی پێشوو ل٧٠ هەروەها بڕوانە لاپەڕە (٦٩) کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا وەرگێڕانی حەمەکەریم عارف.
(٧) سەرچاوەی پێشوو ل٧٠

عوسمانییەکان بەڵێنیان بەمیرانی کورد دابوو، کە لەناوچەی خۆیان میرایەتی خۆیان بکەن، لەسەر ئەو بنەمایە، سەرکەوتنی دەوڵەتی عوسمانی لەشەڕی چاڵدێران شتێکی حەتمی بوو، لەوبارەیەوە ساڵح قەفتان دەنووسێ: «وەفاو یارمەتی بەنرخی کوردەکان نەبوایە یاوز سوڵتان سەلیم پادشای عوسمانی بەزەحمەت بەسەر شا ئیسماعیلی سەفەوی زاڵ دەبوو[8].

## ٢- شەڕی چاڵدێران: سەرەتای یەک بوون یان سەرەتای داگیرکردن و دابەشکردنی کوردستان

ئەوەی لەبارەی شەڕی چاڵدێرانەوە نووسراوە ئەوە دەردەخات کە هەریەک لە لەشکری عوسمانی و سەفەوی لەسەر خاکی کوردستان رووبەڕووی یەکتر بوونەوە، ئەو شەڕە ئەگەر لەڕواڵەتدا مۆرکی فراوانخوازی پێوە دیاربێ، بەڵام لەناوەڕۆکدا لەشەڕێکی مەزهەبی دەچێ بەجۆرێک کاتێ لەشکری شا ئیسماعیلی سەفەوی جارێکی دی شاری تەبرێز دەگرێتەوە لەیەک رۆژدا (١٤٠ هەزار) موسڵمانی سوونە مەزهەب دەکوژێ، سوڵتان سەلیمیش لەبەرامبەردا قەسابخانەیەک لەقزلباشە توندڕۆکانی ئەنادۆل پێکدێنێ[9]. لەو نێوە، دەتوانین بڵێین لەدیدگای «مەنتقی عەقڵ» میرانی کورد بەچاکیان زانیوە پاڵبدەنە سوپای عوسمانلی لەدژی دەوڵەتی سەفەوی، مەولانا ئیدریسی بدلیسی دەورێکی زۆر گرنگی لەیەک خستنی میرانی کوردو کۆکردنەوەیان لەژێر

**(٨) صالح قەفتان، مێژووی نەتەوەی کورد، ل٣٨٤**

**(٩) مجلة السنة، العدد (٥١) ص٥٨**

دەوڵەتی عـوسـمـانی بینیـوە بدلیـسی تەواو لە پێکهاتەی مـیـرنشـینە کوردەکان گەیشتبوو، دەیزانی ئەوانە هەرگیز لەنێو خۆیان یەک نین وەک دەڵێن لەخـودا بەیەک زانین بەولاوە هیچ جـۆرە یەکـێـتـیـەکی دیکەیان لەنێواندا نییە، بەبەڵگەش هەریەک لەحکومەتە کوردیەکانی پێشـوو هیچ پەیوەندیەکـیـان لەنێـواندا نەبووە بەڵکو هەر مـیـرەو لەناوچەی خـۆی سەربەخۆ بووە، ئەو رێکەوتنەی بدلیسی- سەلیم بۆ سەدەی شازدەهەم، کە بیـری «دەوڵەتی قـەومی» لەهیچ شـوێنێ ناوی نەبووە، هەوڵێکی مـەزنی بدلیـسی بووە بۆ یەک بوونی میـرانی کـوردو کـوردسـتـانی عـوسـمـانلی، لەنەزەری مـحـەمـەدئەمین زەکی مـێـژوونووس، رێکەوتنامـەی بدلیـسی- سەلیم ئەو بەندانەی لەخۆگرتووە:

١- پاراستنی سەربەخۆیی میرنشینەکانی کورد.

٢- لەسەر کورد پێویستە لەهەموو شەڕەکان یارمەتی تورک بدات.

٣- لەسـەر تورک پێویسـتـە یارمـەتی کـورد بدات لەدەست درێژییەکـانی دەرەوە.

٤- دەبێ کـورد باجی شـەرعی و خـێـرات بداتە «بیت المال»ی دەوڵـەتی عـوسـمـانی[١٠]. هەروەها میـرانی کـورد دەبوایە لە کاروباری ناوخۆدا سەربەخۆو لەکاروباری دەرەکیدا سەیری دەمی حکومەتی عوسماتیان بکردباو قسە قسەی حکومەتی عوسمانی بوو[١١].

ئەو رێکەوتنە لەناوەرۆکدا لەسیـسـتـەمی فـیـدراڵی دەکـات بدلیـسی

---

(١٠) حمدامین زکي: خلاصة تاريخ الكرد، ص١٨٢-١٨٣
هەروەها بڕوانە گۆڤاری کاروان ژمارە (٢٤).
(١١) د. شەمسی، ل٧٦

توانیویەتی ٥٥ میرنشینی کوردی لەکوردستانی عوسمانلی باشوور و باکوور و رۆژئاوای کوردستان- بۆ میرانی کورد دابمەزرێنێ ئەمەو وەنەبێ ئەو هەوڵەی بدلیسی تەواو لەگەڵ ئامانجی عوسمانییەکان بووبێ، هەریەک لەئێران و دەوڵەتی عوسمانی ویستوویەتی بەجۆرێک هۆزەکانی کورد بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاربێنێ، حکومەتی عوسمانی زۆر سوودی لەو رێکەوتنامەیە بینیوە، لەلایەک «هەراو هۆریای عەرەبەکانی باشووری عێراقی بەهێزی کورد دامرکاندۆتەوە[١٢] لەلایەکی دیکەش هەر بەپاڵپشتی میرانی کوردی هاوسۆز لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی توانی هەرەس بە حکومەتی ئەردەڵانی کوردی لەساڵی ١٥٣٧ بێنێ و بیخاتە ژێر رکێفی دەسەڵاتی عوسمانلی[١٣] سەفەویەکانیش زۆر کەڵکیان لە هێزی کورد وەرگرتووە. لەو سەردەمەدا کوردەکانی موکریان بناغەی هەرە قایمی لەشکری ئێران بوون[١٤]. ئەگەر لەدووای شەڕی چاڵدێران ١٥١٤، میرە کوردەکانی هاوسۆزی بدلیسی توانیویانە سەربەخۆیی ناوچەیی خۆیان بپارێزن، بەڵام هەر ئەو شەڕە بە خاڵی وەرچەرخەنا دادەنرێت و بەجۆرێک لەهەموو رووداوەکانی مێژووی کوردی لەمەودوا رەنگی داوەتەوە[١٥] ئەو دابەشکردنەی کوردستان بۆ دووبەش کۆتایی تەواوی بەململانێی عوسمانلی و ئێرانی نەهێنا، جا بۆ ئەوەی کۆتایی بەکێشەی سنووری نێوانیان بێنن ئەوا لەپاش پەیمانی چاڵدێران چەند پەیمانێکی دیکەیان

(١٢) صالح قەفتان، ل٣٨٤
(١٣) گۆڤاری کاروان ژ (٢٤) ل١٦٣
(١٤) صالح قەفتان، ل٣٨٤
(١٥) د. عبدالرحمن قاسملو، کردستان والأكراد، ص٤٤

لەنێـوخـۆدا بەسـتـووە وەک «پەیمانی زەهاب ١٦٣٩» پەیمانی ئاشـتی ١٧٤٦و پـەیمانـی ئەرزەرۆمـی سـالّی ١٨٢٣ و پـەیمانـی ئەرزەرۆمـی ١٨٤٧(١٦).

سەبارەت بەرێککەوتننامەی بدلیسی- سەلیم، کەوا میرانی کوردو دەولّەتی عوسمانی بۆ ماوەی سێ سەدە دووربوون لە ئاشووبی رووبەڕووی کـوردەکـان بەپێی بەندەکـانی رێککەوتننامـەکـە لە مـیـرنشـینی خـۆیان سەربەخۆ بووینە هیچ هێرشێکی بەرفرەی دەولّەتی عـوسمـانی نەکراوەتە سەر ئەو میرنشینانە، میرانی کوردیش لەبەرامبەر هەر گوێڕایەڵی دەولّەت بوونە، بەلاّم هەر لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم سولّتان مەحموودی دووەم لە ژێر کـاریگەری نیـزامی ئیـداری رۆژئاوایی ویسـتی سـیسـتـەمی مـەرکـەزی بەسـەر هەمـوو دەولّەتدا بسـەپێنێ بەم پێـیـە، دەولّەت لە سیستەمی لامەرکەزیەتی میرنشینە کوردەکان پەشیمان بۆوە ئەمەش خۆی لەخۆیدا پێشێلکردنی رێککەوتننامەکەی بدلیسی- سەلیم بوو، هەر بۆیە هەر لەبەرایی ئەو سەدەیەدا ململانێیەکی توند لەنێوان دەولّەت و کیرانی کورد بەرپابوو لەئاکـامـدا هەم مـیـرنشـینە کـوردەکـان لەنێـووچوون و هەم دەولّەتی عوسمانیش لەبەریەک هەلّوەشایەوە.

## هۆی ململانێی دەولّەتی عوسمانی و میرانی کورد لەسەدەی نۆزدەهەمدا

بە دیدی ئێـمـە چەند هۆکـارێکی نێـو دەولّـەتی و هەرێمی و نـاوچەیی لەپاڵ ئەو ململانێیەدا هەبووینە:

---

(١٦) جمال بابان، بابان فی التأریخ ومشاهیر البابانیین، ص٨٤-٨٥

**یەکەم: دەوری ڕۆژئاوا لەوروژاندنی ئەو ململانێیەدا.**

محەمەدی مەلا کەریم لەم بارەیەوە دەنووسێ: کورد تێکڕا هەمیشە کۆمەڵێ میرنشینی دەرەبەگی جیاجیای لەهەر لایەکی کوردستان هەبووە... دان بەفەرمانڕەوایی دەوڵەتی گەورەی وەخت بنێن و لەکاروباری ناوخۆیانا کەم و زۆر سەربەخۆ بووینە، تەنانەت دەوڵەتی عوسمانیش پاش داگیرکردنی کوردستانی ئێستای عێراق و تورکیا هەربەم جۆرە مامەڵەی لەگەڵ دەکردن و تەنها لەسەدەی (١٩) سیاسەتی خۆی گۆڕی و کەوتە تێکدانی یەک لەدواییەکی ئەو میرنشینانە، کە ئەمە بە بۆچوونی من پێویستی بەلێکۆڵینەوەیەکی وردە تا هۆکەی بزانرێ و بگەینە ئەوە ئاخۆ دەوری دەوڵەتە ئیمپریالیستەکانی ئەورووپا لەخستنەسەر ئەم سیاسەتەی دەوڵەتی عوسمانیدا چی و چۆن بووە[١٧]؟

بەحوکمی ئەوەی دەوڵەتی عوسمانلی دەوڵەتێکی «ئیسلامی» بووەو هەروەها چەندەها نەتەوەو گەلی غەیرە موسڵمانی لەخۆگرد کرد بۆوە هەربۆیە شتێکی چاوەڕوانکراو بوو، کە ڕۆژئاوا هەموو هەوڵێک بەکاربهێنێ بۆ هەرەس پێهێنانی ئەو دەسەڵاتە ئایینییە نەک هەر لەڕۆژهەڵات بەڵکو لەڕۆژئاواش، ڕۆژئاوا ئەزموونێکی تاڵیان چەشتبوو لەشەڕی عەسکەری لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانلی، لەم دیدگەوە لەڕێگایەکی دی دەگەڕان بۆ دەست تێوەردانی دەوڵەتی عوسمانلی. باشترین ڕێگەشیان ناردنی مسیانێرە نەسرانییەکان بوو. لەم بارەیەوە جەلیلی جەلیل دەنووسێ: چالاکی مسیانێرە ئینگلیزەکان لەپاشان ئەمەریکییەکان،

---

(١٧) محمدی مەلا کەریم، بیری سیاسی و کۆمەڵایەتی پیرەمێرد، ل٢٢

لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەم بۆ رۆژهەلاتی ناوەڕاست دەستی پێکرد لەسەدەی نۆزدەهەمیش چالاکییەکانیان گۆڕانێکی شاراوەی بەخۆوە بینی[١٨] شوێنی ستراتیژی کوردستان وای لەحکومەتی بەریتانیا کرد کە بایەخێکی زۆر بەهۆزە کوردەکان بدات، دەزگاکانی سەربە دەولەتی بەریتانیا ، بەتایبەتی کۆمپانیای رۆژهەلاتیی هیندیستان، دەستیان کرد بەلێکۆلینەوەو پشکنینە ئەو ناوچەیەی کەوتۆتە نێوان سنووری تورکیا و ئێران و روسیا کە زۆربەی دانیشتوانەکانی کوردن، بەمەبەستی بلاوکردنەوەی دەسەلاتی بەریتانیا لەناو سەرانی ئەو هۆزانەدا[١٩]... گەشتەکەی کلۆدیس جیمس ریچ لەسالی ١٨٠٦ بەلگەیەکی بەرجەسەتەیە بۆ هەولی دەستێوەردانی ئینگلیز لەکاروباری دەولەتی عوسمانلی و میرانی کورددا، رووسەکانیش لەسالی ١٨٠٤-١٨٠٥ پێوەندییان لەگەل کورد، بەست و ئەم پێوەندییە زۆر زوو لەناوچەکەدا رەنگی خۆی دایەوە[٢٠]. بەحوکمی ئەوەی کوردی و ئاشووری کوردو ئەرمەن لەناوچەی نزیک بەیەک و لەهەندێ شوێن لەنێو یەکدا دەژیان ئەو رەوشە دیموگرافیەش دەرفەتێکی لەباری بۆ سەرانی رۆژئاوا رێکخست کە زێتر دەست لەکاروباری دەولەت وەربدەن، زۆربەی بەلگەکان دەسەلمێنن کە نوێنەرانی رۆژئاوا جۆرەها پلانیان بەکارهێناوە بۆ ئەوەی تۆوری

(١٨) جليلي جليل، من تأريخ، الامارات في الامبراطورية العثمانية، ترجمة د. محمد عبدو النجاري، ص١٢٦
(١٩) د. عبدر بەسکران ابراهیم، پێشبرکێی بیانی لەسەر کوردستان هەتا شەری یەکەمی جیهان، گۆڤاری رۆشنبیری ژ (١٣٠) ل٩
(٢٠) کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیدا، ل٨٩

دووبەرەکی لەنێوان کوردو ئاشووریەکان دروست بکەن[21] بەیاننامەی ئەرزەرۆمی ساڵی ١٨٢٣ش دەرفەتێکی باش بوو بۆ ئەوەی دەوڵەتانی ئەوروپا راستەوخۆ دەست لەکاروباری ناوخۆی کوردستان وەربدەن هەروەها هەوڵبدەن جێ پێ یەک بۆخۆیان لەخاکی کوردستان پەیدابکەن و بگەنە ئەو ناوچە تازانەی کە گەڕیدەکانی ئەوروپایی پێشتر بۆی نەچووبوون[22].

بەندی (٦١) پەیمانی بەرلینیش چاودێری ئەرمەنییەکانی زامن کردبوو[23] هەروەها خۆی لەخۆیدا جۆرە حکومیڕانییەکی ئەرمەنی بەناوچەکەدا سەپاندبوو. هەر لەبارەی دەوری تێکدەرانەی نوێنەرانی رۆژئاوا لەدەوڵەتی عوسمانلی کوردستان بەتایبەتی جەلیلی دەنووسێ «بیرلین ساڵی ١٨٣٦ بەمەبەستی پلان نانەوە، بۆ مارشمعون دەنووسێ «ئەو ئازارەی تۆو گەلەکەت لەو ناوچەیەدا دەیچێژن ئەوا بەهۆی زوڵمی موسڵمانەکانە» هەر لەو بارەیەوە لەساڵی ١٨٣٩ د. گرانت دێتە ناوچەی هەکاری و دەتوانێ مارشمعون بۆ لای خۆی رابکێشێ[24]! تێکچوونی پەیوەندی کوردو نەستورییەکان لەسەردەمی حکومەتی بەدرخاندا هەر دەگەڕێتەوە بۆ دەوری پلانگێڕی رۆژئاوا لەناوچەکەدا، سەرچاوە مێژووییەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە شەڕی کورد و نەستوورییەکان سەرەتایەک بوو بۆ ململانێی دەوڵەتی عوسمانلی و حکومەتی بەدرخان، مەبەستی رۆژئاوا لەو هەوڵانە هەر بۆ ئەوە بووە ناوچەکە لەپەشێویدا بژی!

(٢١) جلیلی جلیل، ص١٢٧
(٢٢) گۆڤاری رۆشنبیری ژ (١٣٠)، ل٨
(٢٣) کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیدا، ل٩٠
(٢٤) جلیلی جلیل، ص١٢٧

ئەگەرنا بوونی چەند میرنشینێکی کوردی لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا، دەبووە هۆی کزبوونی دەستەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی! هەر لەدیدگای «کێشان بەدوو تەرازوو» ئینگلیزو فەرەنسا نەیانهێشت هەوڵەکانی محەمەد عەلی میسری و میر محەمەدی میری سۆران سەر بگرن بۆ دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانلی(٢٥). ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە رۆژئاوا لەخەمی دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی دابووبن، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا نەبوون، کە هێزێکی دی لە ناوچەکە دروست بێ «پێشبڕکێ»ی زلهێزەکان لەسەر دەوڵەتی عوسمانی و کوردستان بەتایبەتی، بەربەستێکی دی بوو لەسەر تێکردنی پەیوەندی گەلانی نێو ئیمپراتۆریەت. هەریەک لە ئینگلیز و فەرەنسا نەیاندەهێشت دەسەڵاتی روسیای قەیسەری لەنێو کورددا پەرەبسێنێ.

روسیاش ماوەیەکی زۆر خەریکی شەڕی ستراتیژی بوو لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا بەتایبەتی لەساڵانی ١٨٢٨-١٨٢٩ و ١٨٥٣-١٨٥٨- و ١٨٧٧-١٨٧٨ . لەم هەموو شەڕانەشدا کورد باجێکی زۆریداوە، لەلایەک میرەکان زۆربەی لەنێو سوپای عوسمانیدا بوون، لەلایەکی دیکەش رووسەکان هەر لەبەرایی سەدەی (١٩)دا پەیوەندیان لەگەڵ هەندێ هۆزی کورد بەستبوو و لەساڵی ١٨٢٩ تیپێکی تایبەتیان لەجەنگاوەرانی کورد لەدژی دەوڵەتی عوسمانی پێک هێنابوو. لەکاتی شەڕەکانی قرمیشدا دوو تیپیان لە جەنگاوەرانی کورد پێکهێنابوو(٢٥)!! لەنێوان ئەم هەموو شەڕانەدا هەرسێ میرنشینی سۆران

**(٢٥) صالح قەفتان، ل٣٧٠**

و بابان وبۆتان رووخـێندران کـەچی رووسـیـا نەک هەر بەهانای کـورد نەهات، بەڵکو رووسـەکـان بەشـداریان لەلێـدانی شـۆڕشـەکـەی شـێخ عوبێدوڵڵای شەمدینیش کرد![27]!

## دووەم: پەشـیـمـانبـوونەوەی دەوڵەتی عـوسـمـانی لەدەسـەڵاتی میرنشینە کوردییەکان؟

پێش سـەدەی (١٩) زۆربەی سـەرکـەوتنەکـانی دەوڵەتی عـوسـمـانی دەگەڕێتەوە بۆ رادەی هاوکـاری و پاڵپـشـتی عـەسکەری هۆزە کـوردەکان. ئەو هاوکـاریەی کـوردیش بۆ دەوڵەتی عـوسـمـانی هەر لەسـەر بنەمـای رێککەوتننامـەی لامەرکـەزیەتی مـیـرنشـینە کـوردییـەکـان بوو، هەروەها، بەحوکمی ئەوەی کوردەکان لەنێوان ئێرانی شیعە و رووسیای نەسرانیدا، دەوڵەتی عـوسـمـانی سـوننە مـەزهەبیـان پێ باشـتربوو، ئەمـەش وەنەبێ دەوڵەتی عـوسـمـانی لەگـەڵ ئەوەدابووبێ، کـە کـوردیش وەک ئێـران ببنەهێـزێکی گـەورە لەناوچەکـەدا، ئێـرانیش هەرچەندە دژی دەسـەڵاتی عـوسـمـانلی بوو، بەڵام ئەویش نەیدەهێشت کـورد ببنە هێـزێـک هەڕەشـە لەسەر ئێران دروست بکەن، «هەر بۆیە کاربەدەستانی دەوڵەتی عـوسمـانی و ئێرانیش بەتەنیا یان بەیەکەوە چییـان لەدەست هاتبێ بەدژی مـیرنشـینە کـوردەکـان بەکـاریان هێناوە، بەتایبـەتی مـیـرنشـینی بابان چونکە ئەو میرنشـینە کەوتۆتە شوێنێکی ستراتیژی لەناوچەکەدا[28]. تێکچـوونی پەیوەندی نێـوان مـیـرانی کـوردو دەوڵەتی عـوسـمـانی پەیوەست بوو

(٢٦) کورد لەئینسکلۆپیدیای ئیسلامیدا، ل٨٩
(٢٧) صالح قەفتان، ل٣٧٨
(٢٨) د. کـاوس قـەفـتـان، چەند لێکۆڵینەوەیەک لەمـێـژووی بابان سـۆران بۆتان ل١٣-١٤

بەپێشێلکردنی بەندەکانی ڕێکەوتننامەی بدلیسی- سەلیم لەلایەن سوڵتان مەحموودی دووەم[٢٩].

سوڵتان مەحموودی دووەم (١٨١٨-١٨٣٩) لەماوەی فەرمانڕەوایی خۆیدا بڕیاریدا کە دەسەڵاتی میرنشینە کوردەکان هەڵوەشێنێتەوەو هەموو دەوڵەت بەسیستەمی مەرکەزیەتی ببەستێتەوە، لەو نێوەش، میرانی کورد لەناوچەی سلێمانی و سۆران و بۆتان بەمە رازی نەبوون. هەریەکەو لە شوێنی خۆی میرنشینێکی سەربەخۆی دامەزراندبوو.

دامەزراندنی ئەو میرنشینانە سەرەتایەک بوو بۆ شەڕێکی خوێناوی لەنێوان میرانی کوردو دەوڵەتی عوسمانی.

هەندێ لەو شەڕانەی دەوڵەتی عوسمانی لەپێناوی پاراستنی گیانی خۆی بووە ئەوەتا هەژار موکریانی لەبارەی شەڕی میر محەمەدی کۆرە لەدژی میرنشینی بادینان و لەئاکام دەستی بەسەر ناوچەکەدا داگرت.

بەرامبەر ئەو هێرشانەی میر سۆران مام هەژار دەنووسێ: عوسمانی زۆر ترسیان لێ نیشت و لەدژی دەستیان بەکارکرد.. بەجۆرێک ئەگەر دەستیان نەگرتایە هێرشەکەی هەتا ئەستەمبوڵی پایتەختی عوسمانیی نەدەوەستا[٣٠]

شەڕی بەدرخانیش لەدژی نەستورییەکان، ئینگلیز و فەرەنسای هەراسان کرد کە بەڕەسمی داوا لەدەوڵەتی عوسمانی بکەن «بەلوتی بەدرخان بشکێنێ و ناسوورییەکانیش بپارێزێ»[٣١] ئەمەو هەر

---

(٢٩) د. عبد ربه، سەرچاوەی پێشوو ل٨
(٣٠) حسن محمود حمەکریم، کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا، ل٧
(٣١) د. کاوس قەفتان، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤

ئینگلیزەکان ئاسوورییەکانیان هانداو هەر خۆشیان کەوتنە گلەیی کردنی لای دەوڵەتی عوسمانی و داوای سزادانی بەدرخانیان کرد[٣٢]. هەرچەندە شەڕی بەدرخان لەدژی ئاسوورییەکان- بە دانپێدانی گەڕیدە ئەوروپییەکان- شەڕێکی ئایینی نەبووە؟[٣٣]، بەڵام ئینگلیز نەیدەویست دەسەڵاتی بەدرخان لەوە زیاتر بڕیکا، دەوڵەتی عوسمانیش بۆ هەلێکی وا دەگەڕا هەتا تاوانی کورد کوشتنی نەخەنە ئەستۆ[٣٤]. هەرچی شەڕی دەوڵەتی عوسمانی بوو لەدژی دەسەڵاتی میرانی بابان، دەگەڕێتەوە بۆ ترسی دەوڵەتی عوسمانی لەدەسەڵاتی میرانی بابان، کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمان، هەرگیز ڕێگایان نەدەدا میرێ لەمیرەکانی بابان، ببێتە والی بەغدا، تا میرنشینی بابان دەسەڵاتی زۆرتر پەیدا نەکاو نەبێتە مایەی سەرئێشە بۆ ئەستەمبۆڵ[٣٥] هەروەها شوێنی ستراتیژی ئەو میرنشینەش دەورێکی گرنگی بینیوە لە ترساندنی هەریەک لەدەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی هەتا رووسیش، هەربۆیە دەوڵەتی عوسمانی بەپاڵپشتی دەوڵەتی ئێران لەلایەک هۆزی جاف لەلایەکی دیکە توانی دەست بەسەر ئەو میرنشینە دابگرێ[٣٦] و لەساڵی ١٨٤٩-١٨٥١ ئەو میرنشینە هەڵبوەشێنێتەوە پاش ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی کەوتنە سەرکوتکردنی میرنشینە کوردییەکان ئەوا لەشەڕەکانی لەگەڵ رووسیاو

(٣٢) لازاریف ل٢٧ هەروەها بڕوانە د. کاوس قەفتان ل٧
(٣٣) محمد سەلام. مافی مێژوویی غەیرە کورد بەسەر کوردستان، ل٣٥
(٣٤) د. کاوس قەفتان، ل٧٤
(٣٥) سەرچاوەی پێشوو.
(٣٦) جمال بابان، بابان في التاريخ، ص٨٩

لەپاشـان لەگـەڵ هاوپەیمانەکـان هەرەس لەدوای هەرەسی تووش بوو. لە ئاکامـیش بەتەواوی لەبەریەک هەڵوەشـایەوەو بە کـوردسـتـانەوەش بەپێی بەرژەوەندی زلهێزانی رۆژئاوایی ئەوسا داگیرکراو دابەشکرا!.[٣٧]

## ٣- پێکهاتەی میرنشینە کوردییەکان

پێش شـەڕی چاڵدێرانیـش، کـورد چەند مـیـرنشـینێکی هەبووە، بەڵام هیچ سـەرچاوەیەک ئامـاژە بەوە ناکـات کـە ئەو مـیـرنشـینانە لەسـەر بنەمـایەکی نەتەوەیی دامـەزرابن هەروەها لەپاش ڕێککەوتننامـەی بدلیسی- سەلیم-یش میرانی کورد چەند مـیرنشـینێکیان دامەزراندووە بەجـۆرێک هەندێ سـەرچاوە ئامـاژە بە دامـەزراندنی (٥٥) مـیـرنشین لە کوردستانی عوسمانلی دەکەن، لە سەدەی (١٩)میش هەرسێ میرنشینی بابان و سۆران و بۆتان لەدیارترین میرنشینەکانی سەردەم بوون.

ئالێـرەدا با ئەم مـەسـەلە بوروژێنین: ئـایا شـەڕی مـیـرانی کـورد لەدژی دەوڵەتی عـوسـمـانی ئامانجێکی نەتەوەیی بووەو لەپێناو کوردستـانێکی یەکگرتوو سەربەخۆ بووە.؟

سەرەتا بەرلەوەی بە «ئا» یان «نەء» وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، با لەپێکهـاتەی کـۆمـەڵایەتی و مـاهیـەتی هزرو ئامـانجی ئەو مـیـرنشـینانە بکۆڵینەوە.

بەحوکمی ئەوەی کورد دەوڵەتی نەبووە ئەوا لەچاو گەلانی دی ناوچەکە لەڕووی کـۆمـەڵایەتی و سـیـاسی پاشکەوتووتر بووە. پەیوەندی

---

(٣٧) مەبەست دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانییە بەپێی ڕێککەوتنامەی سایکس بیکۆ ١٩١٦

---

کۆمەڵایەتیش لەکۆمەڵی کوردەواری، پەیوەندییەکی دەرەبەگایەتی بووە. میرنشینەکانیش هەر لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراون. لەکۆمەڵگای میرنشینی باباندا ئاغا تادووا دڵۆپ خوێنی جوتیاری دەمژی، میرەکانیش لەپێش هەموو شتێکی ترەوە گەورەترین دەرەبەگەکان بوون، دەبوایە خەرجی بۆ خۆیان و سوپایان و، دەست و پێوەندەکانیان ئامادە بکەن، هەندێکیش بۆ دوارۆژ تەرخان بکەن، هەندێکی دیکەش بدەن بەبەغداو کرماشان[٣٨].

وێڕای ئەو کۆمەڵگا چینایەتییە، ئەوا جیاوازی کۆمەڵایەتیش لەنێو کۆمەڵگای میرنشینی باباندا هەبوو، عەشایەرەکان خۆیان بەگەورەترو بەدەست تر دادەنا لەچاو دانیشتوانی گوندەکاندا، جوتیارەکانیش، ئەو جوتیارانەی ریچ لەگەشتەکەیدا باسی کردوون ژیانیان لەژیانی کۆیلەیی دەکرد[٣٩] لەسەردەمی میرنشینی سۆراندا، سەردەمی میر محەمەدی پاشای کۆرە (١٧٨٤-١٨٣٨) دەسەلاتێکی فراوانی لە کوردستاندا هەبووە، کە کوردەکانی عێراق و بەشێک لە ئێران و تورکیای لەژێر فەرماندەدا بووە، ئەم پیاوە ولاتێکی گەورەو میللەتێکی بێ شوماری رەش و رووتی ماندووی لەبەردەستدا بووە، وەکو مامۆستا هەژار باس دەکات، نەرم و شلیی و خاوەخاوی نەزانیوە، هەرکەس سەری بزاوتبا، بزۆتی دەچاو رادەکرد[٤٠] هەروەک چۆن هەریەک لەدەوڵەتی عوسمانی وئێرانی دەیویست سنووری قەڵەمڕەوییەکەی فراوان بکات، میری

(٣٨) د. کاوس قەفتان، ل١٧ هەروەها بڕوانە جمال بابان، ص٨٨
(٣٩) سەرچاوەی پێشوو ل١٨، جمال بابان، ص٨٨
(٤٠) حسن محمود حمەکریم، کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا، ل٦

سۆرانیش بێ ئەوەی بەوردی دیراسەی کۆمەڵگای خێڵەکی دەرەبەگایەتی کورد بکات، دەیویست بە «منطق القوة» نەک «قوة المنطق» چۆک بەمیرنشینە کوردییەکانی دی دابنێ.. بەپێی دابی کوردەواریش هەر میرنشینە خۆی بەسەربەخۆ دادەناو، بگرە مافی میرنشینەکەی وەکو دەمەلۆجی دەنووسێ: «بەمافێکی پارێزراو دادەنا[٤١]. لەلایەکی دیش، میری سۆران لەیەک کاتدا شەڕی ئێران و عوسمانی و میرنشینە کوردییەکانی دەکردو لەهەمان کاتیش لەگەڵ (محەمەد عەلی) پادشای میسری لەدژی ئینگلیز پەیوەندی دەبەست[٤٢] تا لەئاکام هەموو ئەو هێزانە هەریەکەی بەجۆرێک، لەدژی کۆبوونەوەو لەماوەیەکی کورتدا هەرەسیان پێهێنا.

لەدیدی مێژوونووسانی وەک خالفین و جۆزیف و سافراستیان و جەلیلی و بلەچ شێرکۆ و سجادی، بەدرخان میری بۆتان ویستوویەتی دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێنێ[٤٣]، بەلاّم لەکاتێکدا دەوڵەتی عوسمانی خەریکی رووخاندنی میرنشینی سۆران بو میری بۆتان بەهانای میری سۆران نەهات! هەروەک بلّێی هەرێمی سۆران بەشێک نەبووبێ لەکوردستان، هەروەها عوسمان پاشای میری بادینان (ئامێدی)یش لەدوورەوە سەیری لەناوچوونی محەمەد پادشای دەکرد، کەچی ئەوەندەی

(٤١) صديق الدملوجي، امارة بهدينان، ص٤٧ هەروەها ل٥٤ کتێبەکەی د. کاوس قەفتان.

(٤٢) صالح قەفتان، ل٣٧٠

(٤٣) صلاح هوری، امارة بوتان في ظل حكم الامير بدرخان– اطروحة ماجستير، ص٥٨

پێنەچوو هەر ئەو لەشکرە هاتە سەرخۆشی لەعەمادیە (ئامێدی) و گرتیان و بەقوڵ بەستروای ناردیان بۆ بەغدا[٤٤]، چارەنووسی میر بەدرخانیش لەمیری سۆران و میری ئامێدی باشتر نەبووە!.

ئەو عەقڵیەتە ئیقلیمیەی میرانی کورد بەرەو ئەو رایەمان دەبەن کە گومان لە نەتەوەیی بوونی «ئەو میرنشینانە بکەین چونکە لەلایەک ئەو میرنشینانە مێژوویەکی سەرتاسەری پێک ناهێنن[٤٥]، لەلایەکی دیکەش هەست دەکەی «شۆڕش»ی ئەو میرانە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی نەبووە بۆ گۆڕینی کۆمەڵگەی کوردەواری! بەڵکو شۆڕشی بەگ و میرانی کورد بووەو زیاتر بۆ ئامانجی کەسیی خۆیان بووە نەک بۆ رەش و رووتی کورد کە زۆربەی کۆمەڵی کوردەواری پێک دەهێنن؟!.

کە تەواو لەشەڕی میرانی کورد و دەوڵەتی عوسمانی ورد دەبینەوە زێتر رای پێشوومان لەلا بەهێزتر دەبێ. بەواتای تاکو سوڵتان مەحموودی دووەم هەوڵی نەدا سیستەمی میرنشینە کوردییەکان هەڵبوەشێنێتەوەو لەجێی میری کورد، سەرکردەی تورک[٤٦]. دانەنێ میرانی کورد لەگەڵ دەوڵەت هاوسۆز بوون. ئەو هاو سۆزیەش واتای «پاراستنی دەزگای میرایەتی و بەرژەوەندی عەشایەری میرەکانی دەگەیاند[٤٧] هەرکاتێ دەوڵەت لەلامەرکەزیەتی میرەکان پەشیمان بۆوە، هەروەها بەهۆی شەڕەکانی لەگەڵی رووسیای قەیسەری دەوڵەت زۆر لاواز ببوو بەجۆرێک

(٤٤) صالح قەفتان، ل٣٨٠
(٤٥) د. رەفیق صابر، بەرەو مێژوو
(٤٦) سالمێ جاسم، پرۆسەیا پێشداچوونا هزرا نەتەوەیی یا کوردی گۆڤاری هاڤی بوون، ژ (٢-٣) ل٣٩
(٤٧) محمد سەلام، ل٣٦

وەک فرایزەر دەڵێ: کوردەکان حسابیان بۆ دەوڵەت نەدەکردو هەربەیەک سەعات هەولێریان داگیرکرد[٤٨]. هەروەها محەمەد ئەمین زەکیش هەر لەبارەی لاوازبوونی دەوڵەتی عوسمانییەوە دەنووسێ». دەوڵەتی عوسمانی لەباتی هەڕەشەو سزادان هات روتبەی میری میرانی بەمیری سۆران بەخشی[٤٩] هەژار لەمە زیاتریش دەڵێ ئەگەر دەستی میری سۆرانیان ئەستەمبوڵیشی دەگرت[٥٠] هەرچی بەدرخانیش بوو ئەوا دەبوت: من خۆم میرم هیچ میری دیکە لەم ناوە نیە[٥١]! بەواتای دەوڵەتی عوسمانی ئەوەندە لاوازبوو هیچ دەسەلاتێکی لەناوچەکەدا نەمابوو، میر بەدرخان بێجگە لەدەسەلاتی خۆی- دانی بەدەسەلاتی عوسمانی دانەدەنا، هەرچی بابانەکانیش بوون ئەوا هێندە بەهێزبوون بەرادەیەکی وا کە لۆنگریک لەباتی میرنشینی بابان ناوی بنێ ئیمپراتۆریەتی بابان[٥٢] جا ئەگەر وەک هەندێ دەڵێن ئەو میرانە ویستویانە کوردستانێکی سەربەخۆ دابمەزرێنن، دەڵێن ئەگەر لەوکاتەدا هۆشیاری و هزری نەتەوەیی پاڵی پێوە نەنابن بەرژەوەندی کوردستان لەسەرووی بەرژەوەندی میرنشین دابنێین، کەی مەبەستیان بووە کوردستانی سەربەخۆ دابمەزرێنن؟ بەڕای ئێمە عەقڵیەتی خێڵەکی و ئیقلیمی وای لەو میرانە کردووە کە لەسەر ستراتیژیەتێکی قەومیی

٤٨- جيمس بيلي فريزر، رحلة فريزر الي بغداد ١٨٣٤، ص٢٠
٤٩- محمد امين زكي، خلاصة تأريخ الكورد...، ص٢٢٩
٥٠- حسن محمود، ل٦
٥١- صلاح هروري، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٧
٥٢- د. کاوس قەفتان، ١٥

هاوبەش کۆ نەبنەوەو لەئاکامیش چاوەڕێیان کردووە تا دەوڵەتی عوسمانی بەهێز ببێتەوە یەک لەدوای یەک میرنشینەکان بەپاڵپشتی ئیمپریالیستەکان و هێزی عەشایەری کورد بڕوخێنێ!

## کورتەی باسەکە

لەسەدەی نۆزدەهەم ململانێی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات چوارچێوەیەکی دی وەرگرت، پێکهاتەی دەوڵەتی عوسمانی ولاوازبوونی پەیتا پەیتای دەوڵەت بەهۆی سیاسەتی هەندێ سوڵتانی عوسمانییەوە لەلایەک و چاوتێبڕینی ڕۆژئاوا لەو ناوچەیەدا بوو بەهۆی چەند شەڕێکی گەورە لەناوچەکەدا، بەحوکمی ئەوەی جیۆپۆلتیکی کوردستان هاو سنووری ئێران و ڕووسیا بوو، کوردستان ببووە بەشێک لەو ململانێیە هەر دەوڵەتەو بەجۆرێک دەیویست هۆزەکانی کورد بۆخۆی دەستەمۆ بکات، میرەکانی کوردیش بۆ سوود وەرگرتن لەو ململانێییەدا توانیان سێ میرنشینی گەورە لە هەرێمی سلێمانی و سۆران و بۆتان دابمەزرێنن، هەرچەندە ئەو میرنشینانە تەواو لەسەر بنەمای نەتەوەیی دانەمەزرابوون، بەڵام هەریەکەی بەجۆرێک هەڕەشەی لەسەر دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی هەتا شوێن پێی ڕووسی و ئینگلیز لەناوچەکەدا دروست دەکرد. جا لەبەر ئەوەی لەبەرایی ململانێییەتیەکەدا مەسەلەی کورد بەشێک لەستراتیژیەتی ڕۆژئاوا و ڕووسیای پێک نەدەهێناو نەیاندەویست دەوڵەتێکی کوردی لەناوچەکەدا دابمەزرێ.

لەدیدی دەوڵەتی عوسمانیش دروست بوونی کیانێکی کوردی تەواو

سەربەخۆ واتای دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی دەگەیاند.

ئەمەو دەسەڵاتی میرنشینەکانی کورد لەهەندێ کاتدا ئەوەندە بەهێز بووە دەوڵەتی عوسمانی ترساندووە! هەربۆیە بەرژەوەندییەکان دوژمنەکانی دوێنێی لەبەرەیەکدا کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی بەهەموان «هەڕەشەی کورد» سەرکوت بکەن، کەچی بەحوکمی ئەوەی میرنشینەکانی کورد لەسەر بنەمایەکی ناوچەگەری دامەزرابوون- میرنشینەکانی کورد کە هەرسێکیان لەماوە زەمەنییەکی کورتدا خاوەن دەسەڵات بوون، لەپێناوی قەوارەیەکی کوردی نەک لەبەرەیەکدا کۆنەبوونەوە، بەڵکو شەڕی یەکتریشیان دەکرد، لەئاکام تووشی هەرەسێکی وابوون کەوا کاریگەرێکی سەلبی لەسەر رەوتی رووداوەکانی ئایندەش دروست کرد ؟!

---

* لە گۆڤاری کاروان ژمارە (١٤٠) بڵاوبوویتەوە.

# بەشی سێ یەم

# بزووتنەوەی دەستوورخوازی تورکیاو مەسەلەی کورد

## دەروازەیەک

بزووتنەوەی دەستوورخوازی (مەشروطیەت) لە تورکیادا، وای لێ چاوەڕێ دەکرا کە بەرایی دەوڵەتێکی دەستووری لە تورکیا دابمەزرێنێ و گەلانی ناو ئیمپراتۆریەت بە یەکسانی و برایی بژین ، بەڵام هەر وەک چۆن بزاڤی مەشروتەخوازی ئێران نەیتوانی ئاکامەکانی بپێکێ، بزووتنەوەی دەستوورخوازی تورکیاش نەیتوانی دەوڵەتێکی دەستووری دابمەزرێنێ. لەم نووسینەدا، هەوڵمداوە ئەکادیمیانە مامەڵە لەگەڵ بابەتەکە بکەم و خۆم لە نامەوزوعیەت دوور بگرم . سەرەتا وام بە چاک زانیووە لە بەرایی دروستبوونی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی بدوێم ، چونکە ئەوان نوێنەری ئەو بزووتنەوەیە بوون لە پاشانیش، هەوڵم داوە بۆ ئەوەی دەوری کورد دەربخەم لەو بزاڤەدا هەروەها هەڵوێستی ئەو بزاڤەش لە هەمبەر مەسەلەی کورد دا. لە دوا برگەش هەولم داوە لەمەسەلەی کوشتاری ئەرمەن و کورد بدوێم و رووناکی زێتری بخەمە سەر.

### ١- بەرایی دروست بوونی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی

بەپێی رێککەوتننامەی چاڵدێرانی ١٥١٦ی نێوان سوڵتان سەلیمی عوسمانی و مەلا ئیدریس ، میرەکانی نێو کوردستانی عوسمانلی جۆرە

سەربەخۆییەکی ناوخۆیان بۆ دابین کرا، بەڵام دەمێک سوڵتان مەحموودی دووەم ١٨٠٨-١٨٣٩ هاتە سەر حوکم ئەو رێککەوتننامەیەی هەڵوەشاندەوە. سوڵتان مەحموود دەیەویست ، دەوڵەتێکی مەرکەزی لەسەر شێوازی رۆژئاوا دابمەزرێنێ، هەر بۆیە دەستووری «لامەرکەزیەتی» هەرێمە کوردییەکانی هەڵوەشاندەوە. ئەو کردارەی سوڵتان دەرفەتێکی لە باری رەخساند بۆ ئەوەی دەوڵەتە زلهێزەکانی رۆژئاوا دەست لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانی وەربدەن بە جۆرێک بە پێی پەیمانی ئەرزەرۆم ١٨٢٩ دەوڵەتانی رۆژئاوا مافی دەستێوەردانیان لە دەوڵەتی عوسمانی بە خۆ رەوا بینی. هەروەها ئەو کردارەش دەورێکی گرنگی بینی لەسەرهەڵدانی مەسەلەی کورد کە ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ راپەرینی گەلانی بەلقاندا[1]. لە سەردەمی سوڵتان عەبدولعەزیز١٨٦١-١٨٧٦ کرداری سەپاندنی دەسەڵاتی مەرکەزی بە سەر هەرێمەکاندا گەیشتە رادەیەک ، دەرفەتی بۆ دروستبوونی رکابەری تورکیش دروست کرد. لە لایەکی تریش ئەو کردارە عەسکەریانە، ئەمپراتۆریەتی عوسمانی دوچاری قەیرانێکی ئابووری وا کرد بوو کە خەریک بوو هەڕەشەی لە مانەوەی سوڵتانەکانیش دەکرد، بە جۆرێک کە عەبدولحەمیدی دووەم کورسی دەسەڵاتی وەرگرت، دەوڵەت(٢٥٢٨,١٨٨٥)لیرەی زێڕی عوسمانلی قەرزدار بوو[2]هاوکات لەگەڵ دەست بەکار بوونی سوڵتان عەبدولحەمید، مەدحەت پاشا، دەستوورێکی داناو ناوی لێ نا دەستووری عوسمانلی و بانگەشەی

(١) صلاح بدرالدين، غرب كردستان،ص١٦
(٢) مصطفى خوزان ، اسرارالأنقلاب العثماني،ص١٥

دادگەری و یەکسانی و برایی لە نێو گەلانی دەوڵەتی عوسمانیدا دەکرد، بەڵام سوڵتان عەبدولحەمید نەک هەر ئامادەنەبوو پەیڕەوی ئەو دەستوورە بکات ، بەڵکو هەوڵیدا لایەنگرانی دەستوورەکەش دەست بەسەر بکا[٣].

لە بەرامبەر ئەو هەڵوێستەی عەبدولحەمید لە ناوەوەو دەرەوەی دەوڵەتی عوسمانی بەرەی رکابەری سەری هەڵدا: رێکخراوی سەرەکی ئەو رکابەرییەش ، کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی بوو، لەنەزەری هەندێک نووسەر، ئەو رێکخراوە هەر لە سەردەمی سوڵتان عەبدولعەزیزدا وەک رێکخراوێکی رۆشنبیری لە دایکبووە و لە تەمووزی ١٨٦٥ رێکخراوەکە یەکەم کۆنگرەی خۆی (کۆنگرەی دامەزراندن)ی بەستووە و لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید رێکخراوەکە قالبێکی سیاسی وەرگرتووە[٤].

لە ساڵی ١٨٨٩د. عەبدوڵلا جەودەت لەگەڵ سێ لە هاورێیانی ـ کە د.ئیسحاق سکوتی دیاربەکری و ئیبراهیم نەمۆی ئاماوت و مەحمود رەشید چەرکەزی بوون ـ رێکخراوێکی سیاسیان بەناوی «یەکێتی عوسمانلی ـ عوسمانلی اتحادی» بەنهێنی پێکهێنا[٥] ئەو شانەیە لە هەراییدا بەناوی «تەرەقی و ئیتحاد» کاریان نەکردووە[٦] لە پاشان هەر ئەو رێکخراوە بە دروستی لە ساڵی ١٨٩٤ بوو بە کۆمەڵەی ئیتحاد وتەرەقی[٧]. کەوا بێ لەنەزەری نووسەرە کوردەکان ، کۆمەڵەی ئیتحاد و

---

(٣) سەرچاوەی پێشوو
(٤) ساطع الحصري البلادالعربیەو الدولة العثمانیە، ص
(٥) گۆڤاری هیوا، پاریس،ژ(٧)
(٦) فیصل الدباغ، احتواء علی الکتاب..
(٧) سەر چاوەی پێشوو و گۆڤاری هیوا ژ(٧)

تەرەقی لە پاش یەکگرتنی چەند کۆمەڵەیەکی سیاسی پێکهاتووە بە تایبەتی ئەو شانەیەی کە د. عەبدوڵلا جەودەت و هاوڕێکانی پێکیان هێنابوو. کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی هەر لە ساڵی ١٨٩٤ شاندێکی لە لاوە ئازادیخوازەکان کە زۆربەیان لە قوتابخانەی پزیشکی بوون ناردە پاریس بۆ دامەزراندنی لقێکی کۆمەڵە، لەوێ بۆ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەو چاپەمەنی سەربە کۆمەڵە[٨]. لە لایەکی دیش لە ئابی ١٨٩٩ تەلعەت پاشا ـ پۆستەچی بووـ لەگەڵ حەوت لە هاوڕێکانی، یەکەم شانەی (ئیتحاد و تەرەقی)یان لە سلانیک دامەزراند[٩]. لە دەرەوەی دەوڵەتی عوسمانیش، ئەو بەرە ڕکابەریەی لە پاریس گیرسابوونەوە بە هاوکاری ماددی و مەعنەوی ناسیۆنالیستە فەرەنسییەکان و جوولەکەکانی دژە عەبدولحەمید ڕێکخراوێکی سیاسیان بە ناوی ژۆن تورکەکان دامەزراند. ئەو ڕێکخراوەش ـ ئەگەر بەشێک نەبووبێ لە کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی ـ ئەوا حزبێکی سیاسی نزیک بەو ڕێکخراوە بووە. لە ئاکامدا هەردوو بەرەی ڕکابەری عوسمانلی ـ دەرەوەو ناوەوە ـ دوو کۆنگرەی گشتیان گرێدا و جەختییان لە سەر دوو خاڵی سەرەکی کرد: یەکەم : ڕووخاندنی دەسەڵاتی عەبدولحەمید، دووەم دامەزراندنی دەوڵەتێکی دەستووری[١٠]. لە چواری شوباتی ١٩٠٢ ١٩ بەرەی ڕکابەری عوسمانی ، یەکەم کۆنگرەی خۆی بەست[١١] و چەند

(٨) گۆڤاری ڕامان ژ(٢٦)لا٨٥
(٩) مصطفى خوزان ، اسرار الانقلاب العثماني، ص١٦
(١٠) هیوا ئەمین، ناسیونالیستی تورک... لا ١٠
(١١) فیصل الدباغ، سەرچاوەی پێشوو

رکابەرێکی کوردیش بەشداری ئەو کۆنگرەیە بوون بە تایبەتی د. عەبدوللا جــــەودەت -ی بەڕێوەبەرو ســـــەرنووســـــەری گـــۆڤـــاری عوسمانلی(١٨٩٧-١٩٠٤)ئۆرگانی ئیتحاد و تەرەقی -د. ئیسحاق سکوتی و عــەبدولڕەحـمـان بەدرخـانی سـەر نووسـەری ڕۆژنامـەی کوردستان-[١٢] هەروەها شەریف پاشاش لە ژێرەوە پەیوەندی بە ئیتحادو تەرەقییەوە کردووە[١٣]. لە ساڵی ١٩٠٧یش کۆمەڵە دووەم کۆنگرەی خۆی گرێداو لە کۆتایی ئەیلولی ١٩٠٧بەرەی رکابەری ـ کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی ـ خەریکی داڕشتنی بەرنامەیەکی سیاسی و عەسکەری بوون، بۆ ئەوەی ئینقلابێک لە دژی عەبدولحەمید ساز بدەن[١٤]، لــــە ٢٧ی ئەیلولی ١٩٠٧ ئەحمەد رەزابەگی باڵی چەپی ئیتحادیەکان لەگەڵ سزائی بەگ دۆسیەی پەیمانێکی دووقۆڵیان مۆر کرد. بەپێی ئەو پەیمانە بڕیار بوو دەبێ کۆمەڵەی عوسمانلی تەرەقی و ئیتحاد ـ کە لە پاریس بوو ـ لەگەڵ کۆمەڵەی عوسمانلی حوریەت ـ کە بنکەکەی لە سلانیک بوو ـ یەک بگرن و ببن بە کۆمەڵەی(عوسمانلی تەرەقی و ئیتحاد)[١٥] ئامـــانجی ئەو کۆمەڵەیەش بریتی بوو لە : داواکردنی چارەسەری دەستوری و هێنانەدی یەکسانی لە نێوان رەعیەتداو، سەبەستی رادەربرین و کارکردن و پاراستن و زامنکردنی مـاڵ و گـیـانی هاووڵاتیـان، بەسـتنەوەو پابەندکـردنی سوڵتانیش بە بڕیارێکی دیار کراو[١٦].بنکەی ناوەوەی کۆمەڵەی ئیتحاد

(١٢) د. فرهاد پیرباڵ، رۆژنامەگەری کوردی بەزمانی فەرەنسی،لا٢٤

(١٣) د. فرهاد پیر باڵ ، گۆڤاری رامان ژ(٢٦)لا٤

(١٤) ارنست راموزەر، ترکیا الفتاە و الثورە١٩٠٨، ص١٥

(١٥) سەر چاوەی پێشوو

(١٦) گۆڤاری رامان ژ(٢٦)لا١٨٤-١٨٥

و تەرەقی ـ بنکەی سـلانیک بە هاوکـاری سـەرکـردە عـەسکەرییـەکـان، توانیـان دەست بە سـەر هەمـوو دام و دەزگـاکـانی سـلانیکدا بگرن . ئەو راپەرینەش ئەگەر بە نەخشەی جوولەکەکانی دۆنمەش بووبێ، ئەوا سەرکردە سەربازییەکانی هەرێمەکەش بەگەرمی پێشوازی ئەو راپەرینەیان کردو هەر وەک حسـێن حلمی پاشـا ـ پشکێنەری گـشـتی سـوپای عـوسـمـانی لە هەرێمـەکە ـ ئەو راستییە بە عـەبدولحـەمـیـد رادەگـەیەنێ: «بێجگە لەمن هەمـوو ئەفسـەرەکـانی ئەوێ ـ سـلانیـک ـ بوونەتە لایەنگیـری کـۆمـەڵەی ئیـتحادو تەرەقی»[17] ئەو راپەرینەی سلانیک سەرەتای دەست پێکردنی نەخـشـەی ئیـتـحـادیەکـان بوو. کـاریگەری بیـرۆکـەی دەسـتـوورخـوازیی ئیـتـحـادیەکان نەک هەر سوپا بەڵکو توانیـبـووی بگاتە نێـو ئەنجـومـەنی وەزیرانیش: لە کۆبوونەوەی (٩)ی تەموزی ١٩٠٨ی ئەنجوومەنی وەزیران دەردەکـەوێ کـە ناکـۆکی هۆڵی ئەنجـوومـەنی وەزیرانیـشی گـرتۆتەوە: رەزا پاشای فەرماندەی لەشکری عوسمانی بەرگری لە داخوازی ئازادیخوازەکان ـ ئیـتـحـادیەکـان ـ دەکـرد، هەرچی ئیـسـمـاعـیـل پاشـا بوو هەڕەشـەی دەمکوتکردنی ئیـتـحـادیەکـانی دەکـرد[18].لە سـپـێـدەی ١٠ی تەمـووز، خۆپێشـاندانی ئیتحادیەکان شاری ئەسـتـەمبۆلیـشی گرتەوە. راپەڕیوەکـان هەرسێ دروشـمـە مـەرگـەزییـەکـەی ئیـتـحـاد و تەرەقی یان بەرز کـردبۆوە. ڕۆژی ١١ی تەمـووز، ڕۆژنامـەکـان هەواڵی دەست لە کـار کـێـشـانەوەی وەزارەتی فـەرید پاشـاو دامـەزراندنی وەزارەتی سـەعـیـد پاشـایان بڵاو کـردەوە . لە ژێر ئەو گوشارە توندەدا ، عـەبدولحـەمید بەناچاری لە ٢٤ی

(١٧) مصطفى خوزان، اسرارالانقلاب العثماني ،ص١٨
(١٨) سەرچاوەی پێشوو

تەمووز بریاری دا کە ئامادەیە کار بە دەستوری مەدحەت پاشا بکات[19] بەڵام کار لە کار ترازابوو، دەستوور هەر دەستووری ئیتحادیەکان بوو. هەرچی عەبدولحەمید بوو ئەوا تاکو نیسانی ١٩٠٩ هەر وەک «سوڵتان»ێک لە سەر کار مابۆوە، بەڵام ئیتحادیەکان دەیانزانی کە بە مانی عەبدولحەمید ناتوانن تەواوی بەرنامەکەیان جێبەجێ بکەن هەر بۆیە بە شێوەیەکی « دەستووری»لە ڕێگای ئەنجوومەنی پیران و ئەنجوومەنی مەبعوسان لە ٢٧ی نیسانی١٩٠٩ عەبدولحەمید لەسەر کار لابردرا ومحەمەد رەشادیش کرایە «خەلیفەیەکی گوێ ڕایەڵی» ئیتحادیەکان. بەمجۆرە ، جەمسەرەکانی حوکمی دەوڵەت کەوتە دەست سێکوچکەی دکتاتۆریی ئەنوەر پاشای وەزیری جەنگ ، تەلعەت پاشا سەرۆکی ئیتحاد و تەرەقی و وەزیری ناوخۆ و، جەمال پاشای وەزیری هێزی دەریایی و فەرماندەی عەسکەریی پایتەخت[20].

## ٢- ئایدیۆلۆژیاو ستراتیژیەتی ئیتحادییەکان

ئایدیۆلۆژیای سیاسی ئیتحادیەکان لە بەراییدا شاراوە بوو بە واتای نە ئایدیۆلۆژیەکی نەتەوەیی ـ پان تورکیزم ـ بوو، نە ئایدیۆلۆژیەکی نێو نەتەوەیی ـ ئیسلامی یا خود مارکسی بوو. بەڕای نووسەر ، ئەو ئاڵۆزییە خۆی بۆ دوو هۆی سەرەکی دەگەڕێتەوە: یەکەم : بۆچی ئیتحادیەکان هەر لە بەرایی بانگەشەی تورکایەتییان نەکرد؟!بە حوکمی ئەوەی رێکخراوەکە بانگەشەی بە دەستوورکردنی دەوڵەتیان دەکرد، هەر بۆیە رێکخراوەکە

(١٩) هیوا ئەمین ، ناسیونالیستی تورک ، ل٣١٧
(٢٠) گۆڤاری رامان ژ(٢٦)ل١٨٥

تایبەت نەبوو بە تورک ، بە جۆرێک یەکەم شانەی ڕێکخراوەکە لە سەر دەستی کوردان دروست بووە، بەڵکو ڕێکخراوەکە گەلانی دی وەک کورد و عەرەب و چەرکەس و ئەرمەن و جوولەکەی لە خۆ گرتبوو، هەر بۆیە دژوار بوو ڕێکخراوەکە شێوەیەکی ناسیونالیستی تورکی ڕووت وەر بگرێ.

دووەم : ئایا ئیتحادیەکان هەر بۆیە دژی عەبدولحەمید راپەڕینیان کرد بۆ ئەوەی لە عەبدولحەمید ئیسلامی تر بن؟!

هەرچەند لە ڕواڵەتدا ، توانی بوی هەتا کەسانی وەک شێخ سەعیدی نەوورەسیش بە هەڵە ببات وا زەن ببات وکە جاڕدانی مەشروتیەت و دەستوورخوازی ئیتحادیەکان بە شوراکردنیٚ حکومەتی ئایندەی دەوڵەتی عوسمانیيە[٢١]، بەڵام ئەگەر بەوردی لە پێکهاتەی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی بڕوانین بۆمان دەر دەکەوێ ، کە ئیتحادیەکان شۆڕشیان تەنیا لە دژی عەبدولحەمید نەکردووە ، بەڵکو شۆڕشەکەیان لە دژی ئیسلامیش بووە، لەمەشدا بەهەڵە ناچین چونکە دەسەڵاتی ناوەندی بەدەست عەلمانییەکان و سەرکردە غەیرە موسڵمانەکانەوە بوو[٢٢]. لەو ڕوانگەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە بەر لە دەسەڵات وەرگرتن ئیتحادیەکان ، ئایدیۆلۆژیا و ستراتیژیەتی خۆیان لەمەسەلەی پان ـ عوسمانیزم شاردبۆوە. مەسەلەی پان ـ عوسمانیزمیش هەریەکە بە جۆرێک لێی دەڕوانێ . مەسەلەی پان ـ عوسمانیزم بە هەردوو ڕوویەوە هەر لە بەرژەوەندی باڵی شاراوەی پان ـ تورکیزم دا بووە، چونکە لە نێو باڵی

(٢١) سعيد النورس،رحبه العلماء المسماة برجنه الخواص..ص٢٥
(٢٢) هیوا ئەمین، ناسیۆنالیستی تورک، لا٢٥٦

پان ـ عوسمانیزمیشدا دوو ڕەوتی سیاسی جیاواز هەبوون : گروپی یەکەم دەیانویست دەوڵەتی عوسمانی بگۆڕن بە دەوڵەتێکی فیدراڵی و هەموو گەلانی ئیمپراتۆریەت لە حکومەتەکەی بەشدار بن . هەر سێ دروشمە مەرکەزیەکانیش «دادگەری ، یەکسانی ، برایەتی» بێ گوێدانە جیاوازی دین و مەزهەبی و قەومی لە حکومەتەکە بەرجەستە بکرێن . د. عەبدوڵلا جەودەت رابەری ئەو تەزرە بیرەی دەکرد. د. عەبدوڵلا بەو ئەفکارانەی ببووە هیمدادی سیاسی تورکە لاوەکان و گروپی ئیتحاد و تەرەقی[٢٣] هەروا بیرە ئومەمییەکەی عەبدوڵلا جەودەت ئیسلامی نەبووە، بەڵکو مەتریالیستی (مارکسی) بووە. بە بڕوای پرۆفیسۆر شەریف ماردین. عەبدوڵلا جەودەت لە پێشەوەی ئەو کەسانە بووە کە بیری ماتریالیستی نامۆ بە واقعی گەلانی ئەمپراتۆریەت بلاو کردۆتەوە هەر وەک دەنووسێ:«لەو لێکۆڵینەوەمدا کە بە تایبەتی لە سەر کەسێک کە فکرەی لە هەر کەسێکی دی بەرچاوترە، ورد دەبمەوە، ... هەنگێ مرۆڤ دەبینێ کە بیرو باوەڕی رۆژ ئاوایی: ماتریالیست، ئۆرگانیست، داروینیست، چۆن تأسیری لە بیرو بارەڕی ئێمە کردووە»[٢٤]. باڵێکی تری پان ـ عوسمانیزم ، کە کەسانی وەک مراد بەگ-ی باڵی راستی ئیتحادیەکان رابەری دەکرد داوای دەوڵەتێکی عوسمانی یەکگرتووی دەکرد بەلام بە مەرجێ ئیسلام، ئایینی دەوڵەت بێ[٢٥].

گروپی پان ـ تورکیزمیش ، کە باڵی سەرەکی ئیتحادیەکان بوون ،

---

(٢٣) گۆڤاری هیوا، ژ(٧)
(٢٤) سەرچاوەی پێشوو
(٢٥) هیوا ئەمین ناسیۆنالیستی تورک، لا ٢٦٧

نەتەوە پەرستی توندڕەوی وەک ئەحمەد رەزای نوێنەری باڵی چەپی کۆمەڵ و تەڵعەت پاشای سەرۆکی کۆمەڵە و نوێنەری مەدەنییە ڕوناکبیرەکانی تورک و ئەنوەر پاشاو جەمال پاشای نوێنەری عەسکەرییەکانی لە خۆ گرد کردبۆوە. ئەو گروپە کە دینەمۆی ئایدیۆلۆژیای سەرەکی و ستراتیژیەتی دووری ژۆن ـ تورکەکان بوون دەیانوت: «ئێمە تورکین قیبلەی ئێمە تۆرانە » یوسف ئاتچورا لە وتارێک بە ناوی «زیندوو بوونەوە دوای مەرگ هەقە» بە ئاشکرا بیرۆکەی پان ـ عوسمانیزم رەتدەکاتەوە و دەنووسێ: «دەبێ تورکەکان لە عەرەبەکان جیا ببنەوە، هەر چەندی زووش ئەو کردارە جێبەجێ بکرێ ئەوا تورکەکان زووتر دەتوانن دەوڵەتی عوسمانی بکەنە دەوڵەتێکی تورکی[٢٦]» جا وەنەبێ سەرانی ئەو پان ـ تورکیزمە مەبەستییان بووبێ تەنیا وڵاتی تورکان یان دەوڵەتی عوسمانی بکەن بە دەوڵەتێکی تورکی، بەڵکو دەیانویست هەموو ئەو گەلانەی بە ڕەگەز تۆرانین لە دەوڵەتێکی ڕەگەزی کۆبکەنەوە. زارەڤەند لە کتێبی «پان ـ تۆرانیزم» بە پوختی گەلانی رەگەز تۆرانیمان بۆ دەنووسێ: «تورکەکانی عوسمانی دانیشتووی ئەستانەو ئەنادۆل، تەتەرەکانی قەوقاز و ناوەندو خوارووی رووسیا، تورک و تورکمانەکانی، ئۆزبەگ - مەگۆل، مەنجو شونگوزارەکانی ناوەڕاستی ئاسیا، دانیشتوانە رەسەنەکانی سیبیریا، فلنەندەکانی فینلاند و دەوڵەتەکانی بەلتیک و لە دوایشدا هەنگاری و بلگاری هەموویان بە رەسەن تۆرانین[٢٧]» ناسیونالیستە تورکەکان سەرەتا دەیانویست جارێک هەموو

(٢٦) سەر چاوەی پێشوو،ل٢٧
(٢٧) رۆژنامەی ئالای ئازادی، ژ(١٢)

ئەو گـەلانەی بە تورکی دەدوێن وەک تورکـەکـانی عـوسـمـانی ، تورک زمـانەکـانی ئازەربایجـان ، تورکـەکـانی رووسـیـا و جـینی گـەلێـر لە یەک دەوڵەت کۆ بکەنەوە. هەر سـاڵێـک دوای ئینقـلابەکـەی تەمـوزی ١٩٠٨ ماهیـەتی تورکایەتی خۆیان ئاشکرا کرد و کەوتە گرتن و راونانی سەرانی پان ـ عوسـمـانیـزم و بزووتنەوە نەتەوەییە غەیرە تورکەکان بە جۆریک لە دوای شــەڕەکــانی بەلقــان ، لە ئاکــام جــیــا بوونەوەی گــەلە غــەیرە موسلمانەکان وەک یۆنـانییـەکـان و مەکدۆنیـەکـان ، بە جارێک شۆفـیـزمی خـۆیـان هەڵڕشت، کـورد و ئەرمـەن بە خـۆیان و وڵاتەکـەیان کـەوتنە بەر شالاوی توندو تیژی پان ـ تورکیـزم. لێرەدا ، دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە هۆی چییە ، گروپێکی دەسەڵاتدار لە نەتەوەیەک وەک گرووپی ئیـتحاد و تەرەقی شکـۆی نەتەوەکــــەی هەرەس پێ دێنێ؟! بەواتـا چی وای لە ئیتحادیە تورکەکان کرد ، کە بیرۆکەی ناسیونالیزم بەرز بکەنەوە و واز لە ئیسلام بێنن، چونکە بە هۆی ئیسـلام چەند سەدەیەک گەلی سەردەستە و رزگـاریخـوازی گـەلان بوون ؟!ئەو فـکرە سـیـاسـیـەی ئیـتـحـادیەکـان (تورکــەکــان) لە رووی رێکخــستن و ســتــراتیــژەوە زۆر لە کـۆمــەڵەی کاربوناری ئیتالی دەچوو کە خەباتی دەکرد لە پێناوی دەرکردنی فەرەنسی و نەمـسـاوییـەکان لە نیـمـچە دورگەی ئیـتـالیـادا. بەواتـای هاوردەبوونی فکری سـیـاسی ئیـتـحـادیەکـان و کـاریگەر بوون بە بیـرۆکـەو ئەزمـوونی جیهـانی رۆژئاوا دیاردەیەکی پڕ لە راستییە بەتایبەتی مەسەلەی پەسەند کــردنی رەگــەزی Purity of blood لە نێـو فـەرەنسی و ئینگلیـزو جـوولەکـە جـێگەی مـشت و مـڕ نیـیـە . لەو ڕوانگە،کـاریگەری تیـژی

ناسیونالیستی فەرەنسی و یەهودی لە سەر تورکەکان راستییەکی حاشا هەڵنەگرە، چونکە بەرایی چەکەرە کردنی بیرۆکەی دەوڵەتی دەستووری، دەوڵەتی قەومی ، رەگەز پەسەندی لە رۆژئاوا سەری هەڵداوە، گرووپی ئیتحادیەکانیش ، بەتایبەتی تورکە لاوەکان لە رۆژئاواو سلانیک بوون. لەو بارەیەوەش بەڵگەی زۆر هەن ئەوەتە جـوولەکـەیەکی وەک لوملی دەنووسێ: «رەگەزی تورک ـ کە تۆرانییە ـ لە رەگەزی هەموو گەلانی تری رۆژئاوا چاکترە[٢٨]».هەر وەها بە گوێرەی قسەکانی پرۆفیسۆر خدوری و برناردلویس ، ئەو کەسەی کە بیری تۆرانیەتی لە نێو گرووپی تورکە لاوەکاندا بڵاو کردۆتەوە دەیڤد کۆهینی فەرەنسی بووە[٢٩]. لەبەرامبەر ئەو هەڵویستەش ، پاش ئەوەی تورکە لاوەکان هاتنە سەر حوکم دەرگای دەوڵەتییان والاکرد بۆ پرۆسەی بە دیان کردن و بەجوو کردنی گەلانی ناو ئیمپراتۆریەت یان هەر هیچ نەبێ بووژاندنەوەی یەهودیەت و مەسیحیەت، ئەوەتە لە بەڵگەنامەکانی ئینگلیزدا هاتووە کە لە ساڵی ١٩٠٩ چالاکی مسیۆنێرەکان گەرم و گوڕییەکی دیکەی بە خۆوە گرت . قوتابخانەی ئەلیانین -ی جوولەکە لە موسڵ و کازمیە و حیللە و عەمارە و بەسرە دا بە هۆی کۆمەڵەی فەرەنسایی - بەریتانی دامەزرا. لە ژێر چاو دێری د. دەبلیە ئای ویگرامدا مسیۆنێرە ئایینیە بەریتانیەکان چالاکی ئایینی خۆیان لە کوردستانی خواروو پەرەپێدا. لە شاری ئامێدی قوتابخانەیەکی ئایینیان دامەزراند[٣٠] هەروەها جوولەکەی توندڕەو

(٢٨) گۆڤاری راپەڕین ، پاکستان، ژ(١)
(٢٩) سەرچاوەی پێشوو
(٣٠) گۆڤاری هاڤی بوون، بەرلین ژ(٢-٣)ل٧٠

(عەمانوئیل قەرەسۆ) ،یەکێک لەو چوار کەسە بوو کە فەرمانی لە کار لابردنی عەبدولحەمیدی بۆ عەبولحەمید برد بۆ ئەوەی بۆی بسەلمێنێ کە حکومەتی تورکی جوولەکە بەرێوەی دەبات[31]

هەروەها بەڵگەی تر لەسەر ئەوەی کە هۆکاری دەرەوە رۆڵی گرنگی بینوە لەسەر دارشتنی فکری ناسیۆنالیستی تورکی و دەوڵەتی تورکی، دەگەرێتەوە بۆ لەیەکچوونی بیرو ستراتیژیەتی تورکەکان و میلیتاریستە ئەڵمانەکان و د. جەمال نەبەز لەو بارەیەوە دەنووسێ: لاساییکردنەوەی چۆنیەتی دامەزراندنی دەوڵەتی ئەڵمانیا لەلایەن میلیتاریستە پرۆیزەکانەوە لەسەدەی ١٩دا دەورێکی گرنگی گێرا لە بیرکردنەوەی ژۆن تورکەکاندا ، بەتایبەتی چونکە ئەڵمانیا لەسەدەی ١٩دا پێوەندییەکی سوپایی و بازرگانی توندو تۆڵی هەبوو لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا[32] ئەمەو ئینقلابەکەی تەمووزی ١٩٠٨ لاساییکردنەوەیەکی ئەو کاریگەرییەی ئەڵمانەکان بوو. زارەقەند کاریگەری هەردوو شۆرشی رووسیش دەکاتە هۆکارێکی دی بۆ بلاوبوونەوەی بیری تۆرانیزم و دامەزراندنی دەوڵەتی ناسیۆنالیستی تورکی: دەسەڵاتی رووسەکان بۆ ماوەیەکی کەم بورکانی تۆرانیەتی خامۆش کرد، نەژادی سلاڤی بەسەردا زاڵ کردن. بەڵام ئەمرۆ لەنێو ئەو کلاورۆژنەو کەلێنانەی دوو شۆرشی رووسیا کردوویەتییەوە گرمەی بورکانی تۆرانی لە هەموو کاتێک توندترو ترسناکتر دێتە بەر گوێ، دیواری نێوان تورک و تەتەر درز دەباو هەموویان

(٣١) موفق بني المرجة ، صحوة الرجل المريض، ص٨٥
(٣٢) د. جەمال نەبەز، بیری نەتەوەیی کوردی، نە بیری قەومیەتی رۆژهەلاتییە نەبیری ناسیۆنالیزمی رۆژئاواییە،لا٨٥

لە دەوری بەهێزترین و ئاپۆرەترین وڵاتیان کە تورکیایە،کۆدەبنەوە[٣٣]

## ٣- دەوری کورد لە کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقیدا

پاش پاشگەزبوونەوەی دەوڵەتی عوسمانی لە نیزامی لامەرکەزیەتی بنەماڵە کوردییەکان و سەپاندنی نیزامی ناوەندی بەسەر ناوچەکەدا، کورد دەستەوەستان نەوەستان، بەڵکو بە چەندین راپەڕین و شۆڕش وەڵامی دەوڵەتیان دایەوە: شۆڕشەکەی میری کۆرەو میر بەدرخان و یەزدان شێر و شێخ عوبێدوڵلا بەڵگەی کۆنکریتی خەباتی کوردن لە دژی کردارە دزێوەکانی دەوڵەتی عوسمانی.

ئەو کردارەی دەوڵەتیش دەرگای دەوڵەتی والاتر کرد بۆ ئەوەی رۆژئاواییەکان زیاتر دەست لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانی وەر بدەن. هەروەها ئەو هەڵوێستەی دەوڵەتیش بوو بە هۆی ئەوەی مەسەلەی کورد ببێ بە مەسەلەیەکی سیاسی لە ناوچەکەو دەرەوەدا هەروەک لازاریف دەنووسێ: مەسەلەی کورد وەک کێشەیەکی نێو دەوڵەتی لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا سەری هەڵدا ، لە سەدەی بیستەمیش دوای شەڕی یەکەمی جیهان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بایەخی زیاتر بوو[٣٤] ئەگەرچی میرانی کوردخاوەن هیچ حزبێکی سیاسی نەبوون، بەڵام خۆشەویستی نیشتمان پاڵی پێوە دەنان کە بەرگری لە وڵاتی خۆیان بکەن، هەرچی رۆشنبیرانی کورد بوون ئەوا دەیانویست لەگەڵ رووناکبیرانی تورک

(٣٣) رۆژنامەی ئاڵای ئازادی ژ(١٢)ئەفسانی پان تۆرانیزم وەرگێرانی ئەبوبەکر خۆشناو

(٣٤) لازاریف، ئەو هۆکارانەی مەسەلەی کورد پێکدەهێنن،لا٣٧٧

پێکەوە شۆڕشێکی رۆشنبیری و فکری بەرپا بکەن، بەڵام لە بەرایی لەو باوەڕە دانەبوون کە کورد لە دەوڵەتی عوسمانی جیابێتەوە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆی سەرەکی، یەکەم زۆربەی رووناکبیرانی کورد خاوەن پلەو پایەی بەرز بوون لە دەوڵەت. ئەوەتا حەوت لە کوڕانی میر بەدرخان لە شوێنی بەرز بوون لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا[٣٥] هەروەها کەسانی وەک شەریف پاشاو د. عەبدوڵلا جەودەت و شێخ عەبدولقادری شێخ عوبێدوڵلای شەمزینیش خاوەن پلەی بەرز بوون لە دەوڵەتی عوسمانیدا، دووەم هەستی خۆ بەکورد زانینی ئەو رۆشنبیرانە نەگەیشتبووە ئەو ئاستەی بیر لە دەوڵەتی کوردی بکەنەوە، ئەوەتە کەسێکی وەک د. عەبدوڵلا جەودەت یەکەم شانەی ئیتیحادو تەرەقی لەگەڵ هاورێکانی دروست کردووە و بەڕێوبەرو سەرنووسەری ئۆرگانی ئیتیحاد و تەرەقی بووە، باوەڕی بە دروست کردنی دەوڵەتی عوسمانی هەبووە نەک کوردی. هەروەها لە بارەی لاوازی هەستی نەتەوایەتیی کورد، محەمەدەمین زەکی دەڵێ تا تورک نەیوت من تورکم و عەرەب نەیوت عەرەبم،ئێمە نەمان وت کوردین!

بەم واتایە کورد وازی لە مەسەلەی خۆی هێنابوو، ئامادەبوو لەگەڵ تورک بیر لە ئایندەی هاوبەش بکاتەوە، بەو باوەڕەوە، رووناکبیرانی کورد وەک د. عەبدوڵلا جەودەت، د. ئیسحاق سکوتی ئیبراهیم تەمۆ، شەریف پاشا ، هەروەها عەبدولڕەحمان بەدرخان دەوری گرنگیان بینوە لە بیرکردنەوەو بلاوکردنەوەی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقیدا.

---

(٣٥) مالمیسانژ، بدرخانیو جزیره بوتان، ت: شکور مصطفى، ص٣٠

به حوکمی ئەوەی کورد لە نێو ئیتیحاد و تەرەقی دەوری زۆریان هەبووە، بە تایبەتی د. عەبدوڵڵا جەودەت، ئەوا دەتوانرێ زەنی ئەوە ببرێ کە نەک هەر پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان گروپی ڕۆژنامەی کوردستان و گروپی ڕۆژنامەی عوسمانلی ئیتیحاد و تەرەقی هەبووبێ بەڵکو لە ڕووی ڕێکخستنەوەش زۆر لەیەک نزیک بووبن، لەو بارەیەوە د. فەرهاد دەڵێ : ژمارەکانی ٦-١٩ ،٢٤، ٢٥-٢٦، ٣٠-٣١ ڕۆژنامەی کوردستان لە چاپخانەی ئیتیحاد و تەرەقی ناسراو بە «مەطبەعا جەمعیەتا تفاق و قنجیا مسلمانان» چاپکراون[٣٦] عەبدولڕەحمان بەدرخان لەگەڵ د. عەبدوڵڵا جەودەت لە یەکەم کۆنگرەی ئیتیحاد و تەرەقی بەشدار بووە، هەروەها بە حوکمی ئەوەی ڕۆژنامەی کوردستان لە سەردەمی عەبدولڕەحمان بەدرخان هاوشانی بڵاوکراوەکانی ئیتیحادییەکان هێرشی دەکردە سەر سیاسەتی عەبدولحەمید، هەر بۆیە ئەو هەڵوێستەش هاوخەبات و هاوڕکابەری ڕووناکبیری کورد و ئیتیحادو تەرەقی دەگەیەنێ، ئەگەرچی کەسێکی وەک شەریف پاشا باڵوێزی دەوڵەتی عوسمانی بوو بەڵام لەژێرەوە پەیوەندی بە کۆمەڵەی ئیتیحاد وتەرەقی بەستبوو، هەچی مەلا سەعیدی کوردیش (شێخ سەعیدی نورسی) بوو لە بەرایی باوەڕی وابوو، کە گروپی دەستوورخوازی ئیتیحاد و تەرەقی، دەوڵەتی شورا دادەمەزرێنن، کۆتایی بە سەردەمی تاکڕەوی دێت، کەسێکی وەک سەعیدی نورسی کە ستایشی مەشروتیەتی ئیتیحاد و تەرەقی بکا بێگومان زۆر گرنگە بۆ پەیداکردنی پشتیوانی کورد بۆ

**(٣٦) د. فرهاد پیرباڵ ، ڕۆژنامەگەری کوردی بە زمانی فەرەنسی،ل٢٠**

ئیتیحاد و تەرەقی.

لەلایەکی ترەوە ، بێجگە لە پرۆفیسۆر زیا ء ئالکون، زۆربەی رووناکبیرانی کورد پاش دەرکەوتنی ماهیەتی تورکە لاوەکان لە هەڵوێستی خۆیان پەشیمان بوونەوە، بەڵام هەرچی زیا ء بوو ئەوا تورکایەتی وا کاری لێ کردبوو کە لە بیری بچێ کوردیشە!، لەو بارەیەوە هەمیشە ئەو کۆپلە شیعرەی لە ژێر ناوی «بۆ ئەو پیاوەی بە من دەڵێ تورکێ نی» :

من تورک بم یان نا، هاوڕێی تورکم
ئێوەش تورک بن یان نا دوژمنی تورکن(٣٧)
بۆ ناحەزانی دەوتەوە.

## ٤- هەڵوێستی ئیتیحاد و تەرەقی لە هەمبەر مەسەلەی کورد

رووناکبیرانی کورد، نەک هەر پاڵپشتییان لە ئیتحادییەکان کرد، بەڵکو هەروەک لە پێشدا وتمان، راگەیاندنی مەرکەزیی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقیشی بەڕێوە دەبرد، لێرەدا دەتوانین زەنی ئەوەش ببەین کە رووناکبیرانی کورد بە تێکەڵ بوون لەگەڵ بزاڤی تورکەکان و وڵاتانی دەوروبەر بیریان لە ڕێکخستنی سیاسی هەتا راپەڕینی سیاسی و عەسکەریش دەکردەوە، بە جۆرێک دروست بوونی حزبی عەزمی قەومی کوردستان لە ساڵی ١٩٠٠ ئەو راستیانە دەسەلمێنێ هەروەها هەروەک

(٣٧) هیوا ئەمین، ناسیۆنالیستی تورک ، ل٢٦، ئەویش لە د. کەمال مەزهەر کتێبی چەند لاپەرەیەک لە... ، وەری گرتووە.

شۆڕشی ساڵی ١٩٠٥-١٩٠٧ رووی کاری لە ئیتیحادییەکان کردووە بە هەمان شێوەش دەوری خۆی لە بێداربوونەوەی کوردەکانیش بینیوە بە جۆرێک هەر لە ژێر ئەو کاریگەرییەدا شارە کوردییەکانی دیاربەکر، بەدلیس، وان، شانۆی چەندین ڕووداوی سیاسی بوون، ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٠٥ی کوردەکانی دەرسیم پاڵپشتییەکی گەورەی بە خۆوە بینی(٣٨) هەرچەندە د. عەبدوڵڵا جەودەتی دامەزرێنەری کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی هەر لە ساڵی ١٩٠٤ـەوە درکی بە هەقیقەتی ئیتیحاد و تەرەقی کردبوو، هەر بۆیە بۆ خۆی سەربەخۆ لە بریتی «عوسمانلی» ، گۆڤاری «ئیجتیهاد»ی دەرکرد، بەڵام ئیتیحادییەکان لەسەر سیاسەتی چەواشە کردنیان بەردەوام بوون، کاتێک لە ڕێگای کودەتای ١٩٠٨ـەوە هاتنە سەر حوکم ماوەیەک بە گوێرەی دەستووری عوسمانلی کاریان کرد، جا ئەو بارودۆخەی لە ئاکامی کودەتاکەوە هاتەکایەوە زەمینەیەکی لەباری لەبەردەم ڕووناکبیرانی کورد ڕەخساند، بۆ ئەوەی ئەو دەرفەتە بقۆزنەوەو دەوری خۆیان لە حکومەتە دەستوورییەکەی ئیتیحادییەکان ببینن، لە ساڵی یەکەمی حکومەتە دەستوورییەکەدا، کە هێشتا عەبدولحەمید لەسەر کاربوو، ململانێی باڵی مەدەنی و عەسکەری حکومەتەکەی گرتبۆ وە ولەکاتێکدا حکومەت تەواو جێ پێی خۆی توند نەکردبوو، جۆرە ئازادییەک و مافی را دەربڕین و دروستکردنی حزبی سیاسی لە ئارابوو، هەر بۆیە لە ١٩٠٨/٩/٢٥ شەریف پاشا لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخان و

---

**(٣٨) گۆڤاری هاڤی بوون، ژ٢-٣ل٤٥ وەرگیراوەلە جلیلی جلیل، نهضة الاكراد الثقافیه... ص٥٧**

شێخ عەبدولقادری شەمزینی و داماو ئەحمەد و زولکەفل پاشا کۆمەڵەی «کورد تەعالی و تەرەقی جەمعیەتی» دا دەمەزرێنن ، رۆژنامەیەکیش بە ناوی «کورد تعاون و ترقی غزەتەسی کە پیرەمێرد سەرنووسەری بووە دەردەکەن »[٣٩] لە ڕۆژنامەکەدا، ڕووناکبیرانی کورد گەلێک وتاریان لە بارەی هوشیاریی نەتەوەیی کورد بڵاوکردەوە، لەلایەکی تریش لە پاش راگەیاندنی دەستووری عوسمانلی ئەحمەد ثریا بەدرخان دەگەڕێتەوە ئەستەمبۆل، ڕۆژنامەیەک بە ناوی رۆژنامەی کوردستان بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی دەردەکات[٤٠] لە ولاوەش، مەلا سەعیدی کوردی، کۆمەڵەی «یەکێتی محەمەدی» دامەزراندو هەرسێ دروشمە مەرکەزییەکەی ئیتیحادو تەرەقی« دادگەری، یەکسانی، برایەتی »بەرز کرد بۆوە، بە جیدی داوای یەکێتی عوسمانی دەکرد، هەروەها مەلا سەعید لە رۆژنامەی شەرق و کوردستان- کە کۆمەڵە رۆشنبیرێکی کورد لە ئەستەمبۆڵ لە ساڵی ١٩٠٨ دەریان دەکرد- وتاری بڵاوکردۆتەوە هەروەها کۆمەڵەی یەکێتی محەمەدی ڕۆژنامەیەکی بەناوی «وولقان» دەر دەکرد، ئەورسی زۆر بابەتی لەو ڕۆژنامەیەشدا بڵاودەکردەوە، هەروا بەناوی سەعیدی کوردی زۆر وتاری لە رۆژنامەی کورد بڵاودەکردەوە[٤١] گروپێکی دیکە «کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی زانیاری کورد»یان دامەزراند بۆ ئەوەی ئەدەب و فۆلکلۆری کوردیش بووژانەوە ببینێ، لەلایەکی تریش میر

---

(٣٩) گۆڤاری رامان ژ(٢٦) ل٤٧ رۆژنامەی کورد کە زمانحاڵی کۆمەڵەکە بوون لە ١٩٠٨/١١/٩ دەر چووە.
(٤٠) مالمیسانژ، ص٨٣
(٤١) گۆڤاری مەتین، ژ٧٥، ل٦٧ هەر وەها گۆڤاری بانگی هەق ع(٥)ص٢٤

عەبدولڕەزاق بەدرخانیش، قوتابخانەیەکی کوردی لە ئەستەمبوڵ بەناوی قوتابخانەی «دەستووری» کردەوە، ئەو چالاکییە سیاسی و ڕۆشنبیرییانە تەواو ئیتیحادییەکانی هەراسان کردبوو هەر بۆیە بڕیاریان دا کە هەموو چالاکییەکی کوردەکان رابگرن.

لە پاش ڕووداوی ٣١ی مارتی ١٩٠٩ حکومەت دەستی کرد بە گرتن و ڕاوەدوونانی ڕووناکبیرانی کورد، کەسانی وەک شەریف پاشا، ئەمین عالی بەدرخان توانیان خۆیان لە تیرۆری ئیتحادییەکان رزگار بکەن بەڵام هەریەک لە ئەحمەد ثریا بەدرخان و شێخ سەعیدی نورسی دەستگیر کران[٤٢]. بە حوکمی ئەوەی نورسی ڕووناکبیری سەردەمی خۆی بوو، هەر بۆیە کاتێ دەستگیری دەکەن، بە تۆمەتی کوردایەتی تاوانباری دەکەن، خۆیشی لەبەردەم خورشید پاشای سەرۆکی دادگای ئیتیحادییەکان بە راشکاوی دەڵێ: من یەکێک لە تاوانەکانم ئەوەیە کە خەم بۆ ناوچە خۆرهەڵاتییەکان- کوردستان- دەخۆم و داوای دانەوەی مافەکانی ئەکەم و هەمیشە هەوڵ دەدەم کە بگاتەوە بە کاروانی هونەرو زانست و پێشکەوتنی راستەقینە[٤٣] هەرچی شەریف پاشا بوو، ئەوا لە ناوەڕاستی ١٩٠٩ لە پاریس حزبێکی سەربەخۆ بەناوی حزبی ڕادیکاڵی عوسمانی Parti Radicail Ottoman دروست دەکات لە پێناوی بەگژ داچوونەوەی حوکمی دەستووریی گەنجە تورکەکان لەتورکیا و دروستکردنی چەند گۆڕانکارییەکی بنچینەیی لەو حوکمە دەستوورییەی

(٤٢) مالمیسانژ، ص٨٣ هەر وەها هیوا ئەمین،ل٢٧

(٤٣) سەرچاوەی پێشوو

ئەواندا، هەروەها گۆڤارێکیش بە ناوی مەشروتیەت لە ١٥/ ١٠/ ١٩٠٩ دەردەکات[٤٤]. بەڵام لەبەرئەوەی شەریف پاشا نە ئیسلامی بوو نە قەومی ، بەڵکو عوسمانییەکی ڕادیکالی و لیبرالی بوو، هەر بۆیە لە هیچ بڕگەیەکی ئەو پەیڕەو و پرۆگرامەدا ناوی کورد نەهاتووە[٤٥] لە ڕووی ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداریشدا، برایم پاشای کوڕی مەحموودی تیماوی سەرۆکی هۆزی ملی (میلان) بە حوکمی دەستووری ئیتیحادییەکان ڕازی نەبوو و پەنای بردە بەرکۆسارەکانی عەبدولعەزیز و لەوێندەر هاتە کوشتن[٤٦] دوای قەدەغەکردنی چالاکی کوردەکان، خەلیل خەیالی لە ساڵی ١٩١٠ ڕێکخراوێکی سیاسی بە ناوی «هێڤی» لەگەڵ کۆمەڵە قوتابییەکی زانکۆی دەوڵەت پێکهێنا،[٤٧] ئەو ڕێکخراوە سەرەتا گۆڤارێکی بە ناوی «ڕۆژی کورد» بڵاوکردەوە، بەڵام لە دوایی ناوەکەی گۆڕا بوو بە «هەتاوی کورد» کۆمەڵەی هیڤی نەیتوانی دەوری سیاسی خۆی ببینێ چونکە تەنیا لە نێو گروپە ڕۆشنبیرییەکەدا بڵاو ببۆوە، هەر لە ساڵی ١٩٠٩ ئیتحادییەکان، سوپاو هێزێکی چەکداری گەورەیان ناردە سەر بارزان[٤٨] شێخ عەبدولسەلام بارزانی هەر لە ساڵی ١٩٠٧ەوە لە بروسکەکەیدا بۆ بابی عالی لە ئەستەمبوڵ داوای کردووە کە لە ناوچەکەیدا زمانی کوردی و فێرکردن بەزمانی کوردی بە ڕەسمی بڕیاری لەسەر بدرێ، بەڵام ئەو داواکارییەی شێخ لە دادگای ئەستەمبوڵ

(٤٤) د. فرهاد پیربال، ڕۆژنامەگەری کوردی بە زمانی فەرەنسی ، ل٤٢-٤٣
(٤٥) سەرچاوەی پیشوو ل٤٩
(٤٦) کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا ، چاپی کوردی، ل٩١
(٤٧) گۆڤاری ڕۆژی نوێ،ژ٠(٥)
(٤٨) گۆڤاری بەیان ، ژ(١) ل٤٢

بەکارێکی جوداخوازی لە قەڵەم درا[٤٩] هەر بۆیە لە کۆتایی ١٩٠٧ تاکو سەرەتای ١٩٠٨ سوپای عوسمانی هەموو گوندەکانی بارزانی سووتاندو ماڵەکانی تاڵان کردو خەڵکەکەشی بەرەو زیندانەکان ڕاپێچ کرد.

شێخ عەبدولسەلام لە ساڵی ١٩١٣ جارێکیتر لە ناوچەکەدا دەستی بەکاری خۆی کردەوە هەر بۆیە سلێمان نەزیفی لێپرسراوی ویلایەتی موسڵ فەرمانی گرتنی دەرکرد، بەڵام خۆشبەختانە ئەمجارەش شێخ توانی خۆی رزگار بکات لە کۆتایی ١٩١٤ دا شێخ بە خۆی و سێ لە پاسەوانەکانی بە دەستی سۆفی عەبدوڵڵا ناوێک تەسلیم بە سلێمان نەزیف دەکرێت و فەرمانی لە سێدارەدانیان بۆ دەردەچێت و ئەو فرمانە لە ١٩١٤/١٢/١٤ جێبەجێ دەکرێ، هەواڵێکی دیکە دەڵێ لە کانوونی دووەمی ١٩١٥ لە سێدارە دران[٥٠].

لەنێو باکووری کوردستانیش کۆمەڵە سەرکردەیەکی کورد بە نهێنی کۆمەڵەیەکی سیاسی پێکدەهێنن کەسانی وەک شێخ عەبدولقادرو مەلا سەلیم بەدلیسی و شەهابەدین و حاجی موسا سەرکردایەتی ئەو کۆمەڵە نهێنیەیان دەکرد[٥١] ئیتیحادییەکان بەنیازی دەستگیرکردنی مەلا سەلیم و سەرکوتکردنی کۆمەڵەکە، لە حوزەیرانی ١٩١٠ ئالایەکی لەشکر دەنێرنە سەر ڕێگای وان - بەدلیس و مەلا سەلیم لەوێ دەستگیر دەکەن، هەر کە شەهابەدین بەمە دەزانێ هێزێکی پێکهاتوو لە سەد سوار دەنێرێتە سەر لەشکرەکەی تورک و دەتوانێت مەلا سەلیم رزگار بکات[٥٢] ئەو

(٤٩) مەسعود بارزانی ، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد
(٥٠) سەرچاوەی پێشوو
(٥١) هیوا ئەمین ، ناسیۆنالیستی تورک، لا٢٩٧
(٥٢) گۆڤاری رۆژی نوێ ژمارە (٤)

رووبەڕووبوونەوە چەکدارییە، خاڵی وەرچەرخانی شۆڕشەکەی مەلا سەلیم بوو. لەنێوان ساڵانی ١٩١٠- ١٩١٣ ئەو کۆمەڵە شۆڕشگێڕە توانی چەند بەشێکی وڵات لەژێر دەسەڵاتی ئیتحادییەکان ڕزگار بکات، بەڵام لە شەڕێکی نێو شاری بەدلیس، مەلا سلیم و ١٠ پێشمەرگەی ناچار دەبن پەنا ببەنە بەر قونسوولیەی رووسیا لە بەدلیس،کاتێ شەڕی یەکەمی جیهانی هەڵدەگیرسێ، ئیتیحادییەکان هێرش دەکەنە سەر قونسولیەی رووسی و مەلا سەلیم و هاوڕێکانی لە ناو شاردا دەکوژن[٥٣] هەروەک چۆن عەبدولسەلام بارزانی و ڕاپەڕینەکەی بە دەستی خیانەتەوە کپ کرایەوە، ئەوەی مەلا سەلیم و هاوڕێکانیشی هەر بە دەستی خیانەت کوژێنرایەوە، لەو بارەیەوە، مەلا سەلیم خۆی لە دادگای ئیتیحادییەکان دان بەو ڕاستییە دەنێ، خودا نوسرەتی بە ئێمە بەخشی بەڵام غایەن هەبوو لەبەر ئەوە خودانوسرەتی لە ئێمە سەندەوە[٥٤].

ئەگەرچی شۆڕشەکانی کورد، هەتا لە بەشێکی وڵاتیش، پێکەوە بەند نەبووینە، بەڵام کورد لە شۆڕش کردن نەوەستاوە ئەوەتا لەپاش دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەی مەلا سەلیمی بەدلیسیش، لەلایەکی تری وڵات میر عەبدولڕەزاق بەدرخانی کۆنە بالیۆزی عوسمانلی لە پترسبۆرگی رووس داوا لە کاربەدەستانی رووسیا دەکات کە پشتگیری لە دامەزراندنی ئیدارەیەکی کوردی لە کوردستاندا[٥٥] بکەن بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشێکی کوردی، لە نێوان ساڵانی ١٩١٢-١٩١٣ میر عەبدولڕەزاق

(٥٣) سەرچاوەی پێشوو
(٥٤) گۆڤاری ئاڵای ئیسلام ع(١)ص٢٥
(٥٥) Kurdistan News, No: 3,1993

دەچێتە شاری ورمێ، لەوێ لەگەڵ سمکۆی شکاک بە پشتیوانی رووسیا لە شاری «خوی» کۆمەڵەیەکی رۆشنبیری بەناوی گیخاندی پێکدەهێنێ[٥٦] ئامانجی ستراتیژی کۆمەڵەکە هەروەک عەبدولڕەزاق دەڵێت بریتی بوو لە بلاوکردنەوەی وشیاری نەتەوایەتی (کوردایەتی) لەناو کورد دا[٥٧].

لە ساڵی ١٩١٤، بە پشتیوانی رووسیا، میر عەبدولڕەزاق توانی ئیدارەیەکی کوردی لە چالدێران دامەزرێنێ، لە رۆژنامەکانی ئەستەمبوڵ وەک وقت، صباح، تصویری افکار، دەردەکەوێ کە ئەو ئیدارە کوردییە کاریگەرێکی ترسناکی لە حکومەتی ئەستەمبوڵ کردووە، هەر بۆیە حکومەتی ئەستەمبوڵ لە رێگای ئەو رۆژنامانەوە بەیاننامەی «کافر» بوونی میر عەبدولڕەزاق بلاودەکاتەوە، لەمەشدا هەر بۆ ئەوەی رەواج بە وروژاندنی هەستی دینی کوردو تورک بدات ،ئەگەرنا حکومەتەکەی ئەستەمبوڵ و ئیسلام هەریەکی لە دۆڵێک بوو![٥٨]. بەلام شۆڕشەکەی عەبدولڕەزاقیش تەمەنی زۆر درێژ نەبوو، کاتێ بەلشەفییەکان لە ئۆکتۆبەری ١٩١٧ دەسەلاتیان گرتەدەست، لە کانوونی یەکەمی ١٩١٧ لەگەڵ ئیتیحادییەکان ئاگربەستێکیان بەست و لە ئاداری ١٩١٨ لە رێگای پەیمانی برێست لیتۆڤسک بەشێکی بچووکی کوردستانیان لە دەولەتی عوسمانی وەرگرت و بەم جۆرە پەیمانەکە هەم کۆتایی بە شەڕی نێوان رووسیاو ئیتیحادییەکان هێنا[٥٩] هەم کۆتاییشی بە ئیدارە

(٥٦) گۆڤاری ئالای ئیسلام ، کەنەدا ع()ص
(٥٧) سەرچاوەی پێشوو
(٥٨) هیوا ئەمین، ناسیونالیستی تورک، ل٣١٧
(٥٩) Desk,Kinnane Kurdistand ord Kund, P21

کوردییەکەی عەبدولڕەزاق هێنا، هەروەها عەبدولڕەزاق خۆشی لە باشووری وڵات تیرۆر کرا[٦٠].

## ٥- ئیتیحادییەکان و کوشتاری ئەرمەن و کورد

لە نێوان ساڵانی جەنگ ١٩١٤-١٩١٨ ئیتیحادییەکان کوشتارێکی ترسناکیان لە ئەرمەن و کورد کرد، ئەو کۆمەڵکوژییەی دوو نەتەوەی وەک ئەرمەن و کورد، خۆی لە خۆیدا تەعبیری لە ماهیەتی فراوانخوازی و رەگەزپەرستی بزووتنەوەی تۆرانیەت دەکرد، چونکە ئیتیحادییەکان باوەڕیان وابوو کە دەبێ تۆرانییەکان بە زۆری چەکی هەموو جیهان بخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە[٦١] ڕۆژنامەنووسەکانی رووس لە بارەی کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەوە دەنووسن (... شاری وان نە کەسێکی زیندووی تێدا ماوەو نە خانووێکی بە پێوەماوە، لە شاری بەدلیسدا لە هەژدە هەزار ئەرمەنی تەنیا ٣٠٠- ٤٠٠ ژن و منداڵی ئەرمەنی لە مردن رزگاریان بووە، لە بیست و پێنج هەزار ئەرمەنی نێو ئەرزەڕۆم تەنیا دوو سەد کەسێک رزگاری بووە.لە شاری موش و ئەو سێ گوندەی دەوروبەری کە بیست و پێنج هەزار ئەرمەنی لێ دەژیا، پاش رەشەکوژییەکە تاکە کەسێکی لێ رزگار نەبووە»[٦٢].

ئەمە وەنەبێ سەرانی ئیتیحادییەکان نکوڵی لەو رەشەکوژییە بکەن،ئەوەتە یەکێک لە سەرکردەکان دەکان بە ڕاشکاوی بە باڵیۆزی

---

(٦٠) هیوا ئەمین ، سەرچاوەی پێشوو ل٣٣٦

(٦١) سەرچاوەی پێشوو ل٣٤٦

(٦٢) د. کمال مظهر، کردستان فی سنوات الحرب العالمیه الاولی

ئەمریکا لە ئەستەمبۆڵ دەڵێ: ئێمە ٣/٤ی ئەرمەنەکانمان بە کردەوە دەربەدەر کردووە، ئێستا کەسیان لە بەدلیس و وان و ئەرزەرۆم نەماوە... لێ ناگەڕێین ئەرمەنییەک لە هیچ شوێنێکی ئەنادۆڵ بمێنێ[٦٣] سەبارەت بە کوردیش، بەرنامەیەکیان دانا کە هەرچی کوردە لەولاتی خۆیانەوە بۆ ولاتی تورک ئاوارەو پەرش و بڵاوبکرێنەوەو بە مەرجێ ژمارەی ئەو دوورخراو و راگوێزراوانە لە هەر شارێکی تورکیدا زیاتر نەبێ لە ٥٪ی دانیشتوانە تورکەکان، لە ئاکامی ئەو کردارە شۆڤینییەدا (٥٠٠) هەزار کورد گیانیان لە دەست داو (٧٠٠) هەزاریش بە زۆری بۆ ئەنادۆڵ راگوێزرانەوە، بەشێکی زۆری ئەو خەڵکە کلۆڵە ڕاگوێزراوانە هەر بەدەم ڕێگاوە سەرمای سەختی زستان و ماندووبوون و برسێتی کوشتنی بەشێکی تریشیان پێش ئەوەی بگەنە شوێنی بۆ ڕاگوێزراو تورک کوشتنی[٦٤] لە ماوەی شەش حەوت مانگی یەکەمی جەنگدا لە سەرجەمی (١٢) هەزار کەس لە کوردستانی باکوور، نزیکەی هەشت هەزار کەس مردن[٦٥] مامۆستا ئەحمەد خواجە لە بەرگی یەکەمی کتێبی (چیم دی) وێنەیەکی سەردەمی جەنگمان لە سلێمانی و دەوروبەری بۆ تۆمار دەکات:- هەناسەی خۆشی نەما، برسیەتی و نەخۆشی و هەموو جۆرە پەتایەک ولاتی داگیر کرد، دەرمان، پزیشک، چارەساز نەبوو، لە شار لە لادێدا ناڵەی ژن، پیاو، منداڵ، لاشەی لە برسان مردوو شەقام و کەلاوەکانی پڕکردبوو جا تەنیا گیان هەرزان و نان گران بوو، سەرەڕای

---

(٦٣) هنری مورغنطاو، قتل امە، ص٨٧
(٦٤) بلەچ شێرکۆ، مێژینە و ئێستای کێشەی کورد
(٦٥) سەرچاوەی پێشوو

ئەوگرفتارییە لە ناوەڕاستی شاردا، لەسلێمانی و دێهاتەکاندا دەستە دەستە لاوانی کورد ئەکران بە نیشانەوەو بە دەستڕێژی سەربازی تورک ئەکوژران[٦٦].

لێرەدا چۆن دەکرێ شەڕی ئیتیحادییەکان لە دژی ئەرمەن و کورد بە شەڕێکی دینی لێکبدرێتەوە؟ بەڕای نووسەر، مەسەلەکە، هەمووی مەسەلەیەکی سیاسی بووە، سەبارەت بە ململانێی دەوڵەتی عوسمانی و ئەرمەن و ئەگەر هەردوولا بۆ یەک دینیش لە مەسەلەکەدا بدەن ئەوا هەر بۆ وروژاندنی هەستی دینی بووە چونکە ئەگەر نەختێ بۆ بەر لە ڕۆژانی جەنگ بگەڕێینەوە ئەوەمان زیاتر بۆ ڕوون دەبێتەوە کەمەسەلەکە مەسەلەیەکی سیاسی بووەو ڕۆژئاواییەکان دەورێکی گرنگیان بینیووە بۆ زیاتر وروژاندنی ئەرمەنی و عوسمانییەکان لەلایەک، ئەوروپییەکان بەپێی ڕێککەوتننامەی بەرلین بەندی (٦١) چاودێری ئەرمەنییەکانی زامن کردبوو[٦٧] هەروەها خۆی لە خۆیدا، ئەوروپییەکان لە ڕێگای پەیمانی بەرلین، جۆرە پرۆژەیەکی حوکمی زاتی ئەرمەنییان لەسەر کوردستان زامن کردبوو[٦٨] ئەمەو دەوڵەتی عوسمانی کاردانەوەیەکی سەر سەختانەی بەرانبەر بەو کارە نیشان داو لە ساڵی ١٨٨٥ دا کەوتە بەربەرەکانی بزووتنەوەی ڕوو لە گەشەکردنی ئەرمەنییەکان کە لقی لە رووسیا و سویسرا و لەندەنیش هەبوو[٦٩] لەپاشانیش لە ساڵی ١٨٩٤ لە ساسۆندا

(٦٦) ئەحمەد خواجە. چیم دی ، بەرگی یەکەم.
(٦٧) کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا، ٩٧
(٦٨) Kemal oqa,Achronology of Mosul Question p,40
(٦٩) کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا، ل٩٠

پێنج گوندو هەموو ناوچە ئەرمەننشینەکانی تالوری (دالورینح) وێران بوون[٧٠] بە حوکمی ئەوەی بەپێی پەیمانی ئاشتی تورکمانچای بەشی رۆژهەلاتی ئەرمینیا لە ئێران ستێندراو بووە بەشێک لە ئەمپراتۆریەتی رووسی، رووسەکان هەر لە پاش ئینقلابەکەی تەمووزی ١٩٠٨، خەریکی جۆشدانی ئەرمەنییەکانی دەوڵەتی عوسمانی بوون، بە جۆرێک لە نێوان سالانی ١٩٠٨-١٩١٤، رووسەکان نزیکەی دە هەزار خەبیرو سەربازی خۆیان لە ناوچەی ئازەربایجان مۆڵ دابوو[٧١] لە پێناو دامەزراندنی کیانێکی ئەرمەنی لە ویلایەتەکانی رۆژهەلات و باشووری رۆژهەلاتی دەوڵەتی عوسمانیدا، رووسەکان مژۆڵی ئەوەبوون عەشیرەتە کوردەکانی رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ بکەنە سەرباز و بەگژ دەوڵەتی عوسمانی وەبنێن[٧٢] لەلایەکی تر، وەنەبێ ئەرمەنە توندڕەوەکان نکۆڵی لەوە بکەن کە باکووری کوردستان بە خاکی باوک و باپیرانیان بزانن ئەوەتە لە تۆمارەکانی خۆیان هەمیشە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە (هیچ مەڵبەندێک لە جیهاندا بە قەد مەڵبەندەکانی وان و بەدلیس ئەرمەنی نین[٧٣] هەروەها بەناوی «مافی مێژوویی ئەرمەن» بەسەر کوردستانەوە لە تۆماری ئەرمەنییەکاندا هاتووە: ئەو نیشتمانە- کوردستان- چەندین سەدەیە نەتەوەیەکی لەسەر دەژی وەکو ئێمەی ئەرمەن لە رەگەزی ئارین و ئێمەش هەست دەکەین کە ئەو نەتەوەیە زیاتر لە ئێمەوە نزیکن وەک لە

---

(٧٠) سەرچاوەی پێشوو ل ٩١٧

(٧١) S,Shw, History of Ohoman Empire

(٧٢) سەرچاوەی پێشوو

(٧٣) گۆڤاری یەکگرتن، ئەرویج . نووسینەکەی د. فرهاد پیربال

تورک، **بەڵام هەرچەندە کە بەشێکی ئەو نیشتمانەیان- خۆ هەر بەدەستی ئەرمەنییەکانی چاخە کۆنەکان ئاوەدان کراوەتەوە، ئەمڕۆ بە زۆری بە ئیسلام کراوەو بە کورد کراوە**[٧٤] هەر لەسەر ئەو بنەمایەش، ڕۆژئاواییەکان دانیان بەوە ناوە کە ئەو شوێنانە بدرێنەوە ئەرمەنەکان هەروەک لە مادەی ٨٨و ٩٣ پەیمانی سیڤەردا هاتووە، کە ئەرمەنستان لە چوار ناوچەی تەرابزۆن، ئەرزەڕۆم، ڤان (وان) و بەدلیس پێکدێ[٧٥] هەروەها لە پاش کۆتایی هاتنی جەنگیش، قۆمیساری ئەمریکایی بە وەفدی کوردی گوتبوو کە ئەمریکا سوورە لەسەر ئەوەی دەوڵەتی ئەرمەنیا دابمەزرێنێ کە بەشێکی زۆر لە خاکی کوردستان دەگرێتەوە[٧٦].

لەپاش ئەو هەموو راستییە، ئەی بۆچی کورد تاوانبار دەکرێ بەکۆمەڵکوژی ئەرمەنی؟! بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش پێم چاکە یەک دوو خاڵی تر، روون بکەمەوە، یەکەم ئەو کوردانەی بەشداریان لە کوشتاری ئەرمەن کردووە، بەشداریان لە کوشتاری کوردیش کردووە؟! بە واتای ئەو کوردانە بە تەعبیری ئەمڕۆ، جاشی دەوڵەت بووینە نەک نوێنەری کورد.

لەلایەکی تریش وێرای ئەوەی ئەرمەن نیاز پاک نەبووینە بەرامبەر بە کوردو کوردستان بە فیتی دەوڵەتانی رۆژئاوا پێیان لەسەر ئەوە داگرتووە کە بەشێکی وڵاتی کوردان بکەنە دەوڵەتی خۆیان.

هەتا کەسێکی وەک مێجەر نوئیلیش باس لە ترسی کوردان دەکا بەرامبەر نیازی ئینگلیز لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی و زۆر کردن

---

**(٧٤) سەرچاوەی پێشوو**
**(٧٥) کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا ، لا ٩٢**
**(٧٦) مجلە بانگی هەق ، ع(٥) ایار ١٩٩٢، ص٢٤**

لە کوردان بکەونە ژێر ئەو گوشارەوە[٧٧] هەروەها نوئیل لە شوێنێکی تردا دەڵێ بۆ ئەوەی کورد لەگەڵ دیانەکان تەبا بژین، ئەگەر شیابایین کوردیش بکەینە دیان، تەباییەکە زێتر دەرەخسا[٧٨] ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کورد لە دوو رووەوە مافی ئەوەی هەبووە شەڕی ئەرمەن بکات: یەک بۆ کورد،داگیرکردن چ تورک بیکا،یان ئەرمەن هەر داگیرکردنە. دووەم: مەسەلەکە سەبارەت بە کورد، دامەزراندنی دەوڵەتی ئەرمەنی لە کوردستان، خۆی لە خۆیدا داگیرکردنی دینیش بووا بەڵام وێڕای ئەو هەڵوێستانەی ئەرمەنیش ، کوردە شۆڕشگێڕەکان شەڕی ئەرمەنیان نەکردووە، بەڵکو نزیکەی گیانی پەنجا هەزار ئەرمەنیان لە دەست ئیتیحادییەکان ڕزگار کردووە[٧٩] لە کوردستانی باشووریش شێخ ئەحمەد بارزانی هێزێکی پێکهاتوو لە دوو سەد چەکداری ناردۆتە کوردستانی بن دەستی تورکیا بۆ ئەوەی گیانی چەند خێزانێکی ئەرمەنی رزگار بکات، یەکێک لە و خێزانانەی هێزە کوردیەکە رزگاری کردووە، خێزانی ئەندراتیک پاشا بووە، ئەوەی شایەنی باس بێت ئەو هێزەی کورد کە بۆ رزگاری ئەرمەنەکان چووبوو چواردە کەسی بەدەست تورکەکان کوژران[٨٠] لەبەر ئەوەی کورد حکومەتی سەربەخۆی نەبووەو دبلۆماسیەتی بزووتنەوەی سیاسی کوردیش لە ئاستێکی وادا نەبووە رووی ڕاستی ئەو کۆمەڵکوژییەی ئەرمەن و کورد نەک هەر بەجیهان بناسێنێ، بەڵکو بە

(٧٧) مالمیسانژ، بدخانیو جزیرە بوتان،ص١١٠
(٧٨) Kemal,oqa,Achronobgy of Mosul Question,PA
(٧٩) هیوا ئەمین ، ناسیونالیستی تورک، لا٤١٧
(٨٠) مەسعود بارزانی ، بارزانی و بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد، بەرگی یەکەم ١٩٩٢

کۆمەڵی کورد خۆشی، هەر بۆیە تەوفیق پاشای سەرەک وەزیرانی حکومەتی تورک بە راشکاوی تاوانی کوشتاری ئەرمەن دەداتە پاڵ کورد و تورکی لێ بەری دەکات هەروەک دەڵێ: ئەوانەی کوشتاری ئەرمەنیان کرد کورد بوون، تورک و حکومەتەکەشیان لەوە بێ بەرین و ئەگەر پێویستی جەنگ و سەرقاڵ بوون نەبوایە بە جەنگەوە ئەوا حکومەت نەیدەهێشت ئەوە روو بدات و سزای ئەوانەشی دەدا کە راستەوخۆ کردوویانە[٨١].

**ئەنجام:**

دروست بوونی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی گۆڕانێکی نەوعی بوو لە بنەمای خەباتی هاوچەرخانەی تورک و کورد دا، ئەگەرچی رووناکبیری کورد خۆی دەورێکی گرنگی بینی لە دامەزراندن و بەڕێوەبردنی ڕاگەیاندنی مەرکەزی ئەو کۆمەڵەدا، بەڵام کۆمەڵە لە رەوتی شۆشگێڕی خۆی لایداو کەوتە وێزەی نەک هەر رووناکبیرانی کورد بەڵکو نەتەوەی کوردیشەوە.

لەلایەکی تر، ئەو نووسینە، بیرۆچکە دژ بە یەکەکانی ناو کۆمەڵەی دەرخستووە، تەئکیدی لەسەر ئەوە کردووە کە شۆڤینیەتی تورک بەرایی ماڵوێرانی کۆمەڵی عوسمانی بووە هەروەها ئەو نووسینە ئەوەی روون کردۆتەوە کە خودی تورک و ئەرمەن بەرپرسن لە بەرامبەر رەشەکوژی ئەرمەن و کورد نەک کورد وەک هەندێ مێژوونووس دەیانەوێ کوردی پێ تاوانبار بکەن.

---

**(٨١) د. بلەچ شێرکۆ، مێژینە و ئێستای کورد......**

**(*) لە سەنتەری برایەتی ژمارە (٩) بەڵاوبووتەوە.**

# بەشی چوارەم

## هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقی عەرەبییەوە

### پێشەکی

کوردو غەیرە کورد لەسەر مەسەلەی (ویلایەتی موسڵیان نووسیوە، تورکەکان- بەحوکمی ئەوەی کوردستانی عوسمانلی بەبەشێک لەوڵاتی خۆیان دەزانن- ویلایەتی موسڵ بەبەشێک لەتورکیا دەزانن- عەرەبەکان- بەحوکمی ئەوەی ماوەیەک ویلایەتی موسڵ لەڕووی ئیدارییەوە بەشێک بووە لەویلایەتی بەغدا، ویلایەتەکە بەباکوری وڵاتی

---

**ئەم نووسینە تایبەت نییە بەمێژووی ویلایەتی موسڵ یاخود شاری موسڵ لەڕووی مێژووییەوە.**

**ئەگەر بێتو باس لەمێژووی ویلایەتی موسڵ- کوردستانی خواروو یاخود هەر تەنیا شاری موسڵ بکەین، ئەوا ئەمە بەنووسینێک و چەند نووسینێک تەواو نابی هەر بۆ ئامارەکردن دەڵێین: شاری موسڵ بە شاهێدی زۆربەی مێژوونووسە ئیسلامیەکان وەک ئازدی، مەسعودی و ئیبن حوقل و ئەنساری لەکۆنەوە شوێنی نیشتەجێ بوونی کوردان بووە..**

**جارێ بەشی رۆژهەڵاتی موسڵ ئەوا بەشێکی گرنگی کوردستانی خواروو پێکدێنێ لەمەدا هەتا ئینگلیزەکانیش دانیان ناوە کەبەشی رۆژهەڵاتی موسڵ کوردستانە هەروەک ژەنیرال ساندرس لەئاهەنگی کردنەوەی یەکەم پردی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوای موسلدا گوتی:**

**ئەو پردە کوردستان و عێراق بەیەکەوە دەبەستێتەوە، ئەوە لەکاتی هاتنی کۆمیتەکەی کۆمەڵەی گەلانیش بۆ ناوچەکە بۆیان دەرکەوت کە خەڵکی ناوچەکە هیچ کاتێ خۆیان بەبەشێک لەعێراقدا نەزانیوە بۆ بەزیاتر زانیاری بڕوانە د. عەبدولفەتاح بۆتانی، مدرسە ١١اذار، ص١٤، ١٥، ١٦**

خۆیان دەزانن، لەپاش جەنگی یەکەمی جیهانی هیچ کام لا تورک و عەرەب نەی دەتوانی بەدەسەلاتی خۆی بەتەنیا ئەو مەسەلەیە بۆ بەرژەوەندی خۆی یەکلابکاتەوەو ناوچەکە داگیر بکات لەو نێوە ئینگلیز بەناوی هاوپەیمانەکان بەزەبری هێز ئەو ویلایەتەی بەبێ ویستی کورد بەعەرەبەکانی عێراقدا.

ئەم نووسینە هەولدەدا لەو هۆکارانە بکۆڵێتەوە کە دەوری گرنگیان بینیوە لەلکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقی عەرەبییەوە، بەرلەوەی یەکسەر لەهۆکارەکان بکۆڵینەوە بەچاکمان زانی پێناسەیەکی ویلایەتەکە بکەین بۆ ئەوەی خوێنەر باکگراوەندێکی کەلتووری لەبارەی کێشەکەوە هەبێ و زووتر ماهیەتی مەسەلەکەی بۆ روون ببێتەوە.

## پێناسەی ویلایەتی موسڵ

دامەزراندنی دەولەتی سەفەوی لەئێراندا لەلایەک بەرەسمی کردنی مەزهەبی «شیعەی ئیمامی» بەسەر هەمو ئێراندا لەلایەکی دی، ململانێی سەفەوی و عوسمانلییەکانی تیرتر کرد، ئەو دووهێزە لەپەنای «شەڕی مەزهەبی» مالوێرانییەکی گەورەیان بەسەر گەلانی تورک و فارس و کورد هێنا ، بەحوکمی ئەوەی ولاتی کوردان لەزۆر بەرەوە کەوت بووە نێوان بەرداشی هەردوولا ، بۆیە کورد باجێکی زۆری ئەو ململانێیەیدا[1] ،

(١) ئەم نووسینە تایبەتە بەمەسەلەی موسلەوە، بۆیە لێرەدا جێی ئەوە نابێتەوە بەدرێژی لەململانێی سەفەوی- عوسمانلی بدوێین.

سەفەوییەکان هەر لەبەرایی دروستبوونی دەوڵەتەکەیان[2] دەیانویست قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەیان فراوانتر بکەن، بۆیە هەر لەساڵی ١٥٠٨ شاری موسڵیان داگیرکرد، لەنەزەری گەلانی ناوچەکە، ئەو داگیرکردنە هەر داگیرکردنی خاک نەبوو، بەڵکو هەوڵێکی جدی دەوڵەتی سەفەوی بوو بۆ بەشیعەکردنی گەلانی ناوچەکە. ململانێی سەفەوی- عوسمانلی لەشەڕی چاڵدێران (ئابی ١٥١٤) قاڵبێکی دیکەی وەرگرت، چونکە ئەمجارە کورد دەورێکی گرنگیان بینی لەشکست پێهێنانی سەفەوییەکاندا. لەو شەڕەدا، عوسمانلییەکان توانیان «تەبریزی» پایتەختی سەفەوییەکانیش داگیر بکەن، دبلۆماسیەتی مەولانا مەلا ئیدریسی بەدلیسی دەورێکی گرنگی بینی لەبەیەککردنی میرانی کورد لەژێر دەسەڵاتی عوسمانلییەکاندا، سوڵتان سەلیم بەڵێنی بەمەولانا ئیدریسی دابوو کە ئەگەر بێتو کورد لەوشەڕەدا پاڵپشتی بکەن، ئەوا هەر میرە دەتوانێ لەناوچەی خۆی سەربەخۆ بێ، لەئاکام تاکو بەرایی سەدەی نۆزدەهەم لەنێوان میرانی کوردستانی عوسمانلی و دەوڵەتی عوسمانلی شەڕێکی ئەوتۆ رووی نەداوە وەک ئەوەی لەسەدەی نۆزدەهەم روویدا[3]پاش شەڕی چاڵدێران، بەدروستی لەساڵی ١٥١٦-ەوە موسڵ کەوتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانلی، لەپاش ئەم دەست بەسەراگرتنە، موسڵ

---

(٢) بەپێی هەندێ سەرچاوە، ساڵی ٩٠٦ کۆچی بەرایی دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوییە، هەروەها ساڵی ٩٠٧ی کۆچی ساڵی بەشیعەکردنی ئێرانی ئەمڕۆیە.
(٣) بڕوانە هۆی ململانێی دەوڵەتی عوسمانلی و میرانی کورد لە سەدەی نۆزدەهەمدا.

بوو بەلیوا (سەنجەق)ێکی عوسمانی سەر بەویلایەتی دیاربەکر[٤] د. فازل حوسێن لەکتێبی، «مشکلة الموصل» دەنوسێ: سلێمان قانونی لەساڵی ١٥٣٤ موسڵی داگیرکردو خستییە نێو قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی[٥] د. ئازاد نەقشەبەندی دەنووسێ لەساڵی ١٥٣٩، موسڵ وەک مەڵبەندێکی ویلایەتی عوسمانی، سەربەخۆبووە[٦] لەبەڵگەنامەیەکی عوسمانی ساڵی ١٥٣٩-١٥٤٠ سنووری ویلایەتی موسڵ ئەوسا بەمجۆرە دیاری کراوە: ویلایەتی دیاربەکر لەباکوور، ویلایەتی شارەزوور لەرۆژهەلات، ویلایەتی بەغدا لەباشوور، ویلایەتی ریقە لەرۆژئاوا سنووری بووە، بەگوێرەی ئەو بەڵگەنامەیە سنووری ئیداری موسڵ وەک ئێستا نەبووە بەڵکو ئەوسا ویلایەتەکە شەش سەنجەقی لەخۆگرتبوو شاری موسڵ-یش ناوەندی ویلایەتەکە بووە سەنجەقەکان ئەمانە بووینە: ئەسکی موسڵ، تکریت، زاخۆ، عانە، کەشاف، ئەم دابەش بوونەش یەکەمین دابەش بوونێکی ئیداری ویلایەتی موسڵ بووە[٧] ئەمەو عوسمانییەکان ئەو ناوچەیان وەک بنکەیەک بەکاردەهێنا لەدژی دەسەلاتی سەفەوی لەبەغدا، هەربۆیە سەفەوییەکان لەدەرفەتێک دەگەڕان ئەو ناوچەیە لەژێر دەسەلاتی عوسمانییەکان دەربهێنن، لەساڵی ١٦٢٣ بەکر سوباشی ئاژاوەیەکی لەبەغدانایەوە لەئاکامدا سەفەوییەکان توانیان لەو

(٤) د. ئازاد نەقشبەندی، کێشەی موسڵ یان کێشەی نەوت؟ گۆڤاری مەتین ژمارە (٥٧) تشرینی یەکەم. ١٩٩٦، ل٥.
ئەو شەرە ناسرابوو بەشەری دمرج دابق، بروانە، د. عبدالفتاح بۆتانی، ص١٩.
(٥) د. فاضل حسین، مشکله الموصل، بغداد ١٩٧٧، ص١٠٤.
(٦) سەرچاوەی ژمارە (٤).
(٧) سەرچاوەی پێشوو.

ســـاڵەدا دەست بەســـەر مـــوسڵ دابگرن، بەڵام لەســـاڵی ١٦٢٦ عوسمانییەکان توانیان جارێکی دی دەست بەسەر شارەکەدا بگرنەوە[٨] لەساڵی ١٦٣٨ سوڵتان مورادی چوارەم دەستی بەسەر هەموو «عێراق»دا داگرت و کردی بەسێ ویلایەت موسڵ، بەغدا، شارەزوور لەکەرکوک، هەروەها پاش چەند ساڵێکی کەم دەستی بەسەر بەسرەش داگرت و، کردی بەبەشێک لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی[٩] لەمەدا دەردەکەوێ کە ئەوسا سلێمانی و هەولێرو کۆیەو رواندز... لەڕووی ئیدارییەوە سەر بەویلایەتی موسڵ نەبوون، بەڵکو کەرکوک و رانیە، هەولێر، رواندز و کفری.. سەر بەویلایەتی شارەزوور بووینە[١٠] لەســـاڵی ١٦٣٩ سەفەوییەکان و عوسمانییەکان رێککەوتنامەی «زەهاوی» یان لەبارەی دیارکردنی سنووری هەردوولا مۆرکرد، هەر لەو مێژووەوە تاکو ساڵی ١٨٧٩ زۆر گۆڕانکاری بەسەر ویلایەتی موسڵدا هاتووە، سەردەمێ تەنها سەنجەقێک بووە، بۆ ماوەیەکیش بەتایبەتی لەساڵی ١٧٢٦ ناوچەکەو دەوروبەری لەژێر دەسەلاتی «والی»یەکی عەرەب دابووە[١١]

---

(٨) نەجم سورچی، مصير ويلايه الموصل (كردستان الجنوبية ما بعد عام ٢٠٠٠)، سليماني ١٩٩٩، ص٢٩.

(٩) د. فاضل حسين، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٤-١٠٥.

(١٠) خالد دلير، كيف الحقت كردستان الجنوبية بالدولة العراقية؟ من منشورات دار ديموكراس للنشر، تشرين الثاني ١٩٩٢، ص١٠.

(١١) د. فاضل حسين، سەرچاوەی پێشوو ص١٠٥ پێش ئەو ماوەیە شارەکە بۆ ماوەیەکی زۆر لەژێر دەسەلاتی میرانی کورددابووە، بڕوانە د. عبدالفتاح بوتانی، ص١٩-٢٠.

---

بەڵام لەسەردەمی مەدحەت پاشا جارێکی دی موسڵ بۆتەوە ویلایەت، ئەوسا سنووری ویلایەتی موسڵ بەمجۆرە بوو: ویلایەتی دیاربەکرو وان لەباکوور، مەملەکەتی فارس لەڕۆژهەڵات، سەنجەقی (دیر الزور) لەڕۆژئاوا، ویلایەتی بەغدا لەباشوور سنووری بووە[١٢] لەساڵی ١٨٧٩ گۆڕانکاری لەئیدرەی ویلایەتەکان ڕوویدا هەردوو سەنجەقی کەرکوک و سلێمانیش خرانە سەر ویلایەتی موسڵ، لەئاکام ویلایەتی موسڵ بوو بە ویلایەتێکی سەربەخۆ[١٣].

## پێکهاتەی ئیداری ویلایەتی موسڵ پاش ساڵی ١٨٧٩

ویلایەت ویلایەتی موسڵ

| لیوا | موسل | کەرکوک | سلێمانی |
|---|---|---|---|
| قەزا | موسل- ئامێدی<br>زاخۆ- دهۆک<br>ئاکرێ سنجار | کەرکوک- رواندز<br>کۆیە- رانیە<br>هەولێر- کفری | سلێمانی، گوڵ عەنبەر<br>مەعمور حەمید ـ بازیان<br>شارباژێر- جاف |

هەر لەبەرایی ململانێی سەفەوی و عوسمانیدا تاکو هاتنی ئینگلیز بۆ ناوچەکە، هیچ کیانێ بەو هەموو نەتەوەو مەزهەب ، دینەوە بەناوی عێراقەوە نەبووە، بەحوکمی ئەوەی ناوچەی کوردی لەڕووی جوگرافی و کەش و هەواوە زۆرجیاوازە لەناوچەی عەرەبی هاوتخووبی وڵاتی کوردان،

(١٢) نەجم سورچی، سەرچاوەی پێشوو، ص٣٠.
(١٣) د. ئازاد، سەرچاوەی پێشوو، ل٧.

بۆیە مێژوونووسەکانی پێشوو ناوچەی کوردیان بە «اقلیم جبال»یان بە «عێراقی عەجەمی» ناوبردووە.(١٤) لەسەردەمی فەرمانداری عوسمانییەکانیش کوردستانی باشوور دووبەش بووە هەندێکی لەسەردەمێکدا سەر بەویلایەتی موسڵ بووە هەندێکیش سەر بەویلایەتی شارەزوور بووە لەپاشان لەساڵی ١٨٧٩ هەردوو بەش کران بەبەشێک لە ویلایەتی موسڵ، هەر لەزەمانی یۆنان و رۆمانییەکان ناوی «عێراقی ئەمرۆ» بەوڵاتی نێوان دوو زێ - میسۆبۆتامیا هاتووەو، بەرلەوەی ئیسلامیش بێتە ناوچەکە «عێراق» بەشێک بووە لەدەوڵەتی فارسی(١٥). لەهەمووش گرنگتر هەتا ئەو کۆمیتەیەی، کۆمەڵەی گەلان بۆدیارکردنی چارەنووسی ویلایەتی موسڵ پێکی هێنابوو، هەرچەندە لەژێر گوشاری بەریتانیا، بڕیاری لکاندنی ویلایەتی موسڵی بە عێراقی عەرەبی راگەیاند، بەڵام هەر ئەو کۆمیتەیە دوو راستی زۆر گرنگی لەبارەی ئەو ویلایەتەوە دوپات کردەوە: یەک دانیشتووانانی ویلایەتی موسڵ ٨/٥ی کوردن، کوردیش نە تورکن و نەعەرەب، بەڵکو لەڕەگەزی ئارین.

دوو: ئەگەر بیانووی نەژادی، «نەتەوەیی» بەفاکتەرێکی یەکلاکەرەوە دابنرێت، ئەوا دەبێ دەوڵەتێکی کوردی لەویلایەتی موسڵ دابمەزرێ(١٦).

لێرەدا رووبەڕووی دووپرسیاری زۆرگرنگ دەبینەوە:

یەکەم. ئایا ویلایەتی موسڵ سەد لەسەد وڵاتی تەنها کوردانە؟.

---

(١٤) د. عبدالفتاح بوتانی، ص١٥.

(١٥) كمال مجيد، النفط والاكراد، دراسة العلاقات العراقية- الايرانية- الكويتية، لندن ١٩٩٧، ص١٤.

(١٦) بڕوانە، د. ئازاد، د. فاضل حسين، خالد دلێر، د. قاسملو...

دووەم. بۆچی تورک و عەرەب پشتییان لەکورد کرد لەئاکام ئەوەی پێی دەوترێ «عێراق» لەسەر حسابی کورد دروست بوو؟! ناتوانرێ بانگەشەی ئەوە بکرێ، کەویلایەتی موسڵ تەنیا کوردی لێ یە ئەم دیاردەیەش دەگەڕێتەوە بۆخودی سروشتی کەسایەتی کورد، ئەو کەسایەتییە دەمارگیری نەتەوە پەرستی پیسی نەکردووە، هەر لەوبارەیەوە مێژوونووسی کورد (محەمەدئەمین زەکی بەگ) دەنووسی تا تورک نەیگوت تورکم، عەرەب نەیگوت عەرەبم، ئێمە هەر دەمانوت «عوسمانی»یم، بەمجۆرە کە ئەوان لە «عوسمانیەت» هەڵگەڕانەوەو بۆ تورکایەتی و عەرەبایەتی کاریان کرد، ئینجا کورد تەنها بۆ کوردایەتی ئیشی کرد، ئەو سروشتە پاکەی کورد وای لەگەلانی دی نزیک بەولاتی کوردانەوە کردووە بەرەو ولاتی کوردان کۆچ بکەن، لەکوردستان بێجگە لەکورد، تورکمان، عەرەب، ئاشوریش هەن، بەڵام ڕێژەی کورد بە هیچ جۆرێ دەگەڵ ئەو گەلانە بەراورد ناکرێ، لەپاش سەرهەڵدانی کێشەی ویلایەتی موسڵ تورکیاو عێراق و بەریتانیا دەستیان کرد بەسەرژمێری ویلایەتی موسڵ، هەرسێ لا، بەپێی بەرژەوەندی خۆیان، ژمارەی گەلانی ناوچەکەیان خەملاندووە، هەرسێ لاش ژمارەی کوردیان کەمکردۆتەوە هەروەها ئەو خەملاندنانە تەنها کوردە موسلمانانەکانیان بەکورد داناوە هەرچی یەزیدی، مەسیحی، کاکەیی[17]، شەبەکن بەکوردیان دانەناون.

هەربۆ دەرخستنی ڕاستییەکان، ئەوا خەملاندنی هەرسێ لا

---

**(١٧) کاکەییەکان خۆیان لەئیسلام جیاناکەنەوە، بەڵکو خۆیان بەموسلمان دادەنێن، بەڵام د. ڕەشاد میران لەدکتۆرا نامەکەیدا وادەردەخات کە کاکەییەکان موسلمان نین، چونکە زۆر دابی ئیسلامی پەیڕەوناکەن وەک نوێژ، ڕۆژوو....**

دەخەینەڕوو، کە لەهەرسێکیان ژمارەی کورد کەمکراوەتەوە:

## سەر ژمێرییەکانی ویلایەتی موسڵ[18]

| نەتەوە و کەمایەتییەکانی ویلایەتی موسڵ | خەملاندنی تورکیا ڕاپۆرتی تورکی بۆ لۆزان | خەملاندنی بەریتانیا ڕاپۆرتی ئینگلیز ۱۹۲۱ | خەملاندنی عێراق |
|---|---|---|---|
| کورد | ۲٦۳،۸۳۰ | ٤۲۳،۷۲۰ | ٤۹٤،۰۰۷ |
| عەرەب | ٤۳،۲۱۰ | ۱۸٥،۷٦۳ | ۱٦٦،۹٤۱ |
| تورکمان | ۱٤٦،۹٦۰ | ٦٥،۸۹٥ | ۳۸،٦٥۲ |
| ئاشوری | ——— | ٦۲،۲۲٥ | ٦۱،۳۳٦ |
| جولەکە | ۳۱،۰۰۰ | ۱٦،۸٦٥ | ۱۱،۸۹۷ |
| یەزیدی | ۱۸،۰۰۰ | ۳۰،۰۰۰ | ۲٦،۲٥۷ |
| شارییەکان | ٥۰۳،۰۰۰ | ——— | ——— |
| کۆچەرەکان | ۱۷۰،۰۰۰ | ——— | ——— |
| کۆ | ٦۷۳،۰۰۰ | ۷۸٥،٤٦۸ | ۷۹۹،۰۹۰ |

وەک لەبەرایی وتمان، ئێمە وەک کورد دان بەوە دەنێین کە غەیرە کورد «لەویلایەتی موسڵدا هەبووە (هەیە)، بەڵام کە لەو خەملاندنانە ورد دەبینەوە ئەو چەند ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێ:

یەک: تورکەکان، ژمارەی کوردو عەرەبیان لەویلایەتەکەدا بەجۆری خەملاندووە کە لەڕاژەی بانگەشەکەیاندا بێ، لەبەرامبەر ژمارەی

(۱۸) بڕوانە د. فاضل حسین، ص.۸۲ نەجم سورچی، ص۳٤.

تورکمانیان بەجۆرێ زیادکردووە کە نزیک بێ لەژمارەی کوردان.

دوو: عەرەبەکان.. ژمارەی کوردو تورکمانیان کەم کردۆتەوەو، لە بەرامبەردا، ژمارەی عەرەبیان زیادکردووە بۆ ئەوەی نزیک بێ لەژمارەی کوردان.

سێ: خەملاندنەکەی بەریتانیا لەسەر بنەمای دینی دانراوە، لەمەشدا مەبەستی خۆیان هەبووە هەرچ نەبێ بۆ ئەوەی کوردە یەزیدی و کاکەیی و مەسیحی و شەبەکەکان بەکورد دانەنێن هەروەها بەحوکمی ئەوەی بەریتانیا دەیویست ویلایەتەکە بەعێراقی عەرەبی بلکێنێ، هەربۆیە ژمارەی کوردو تورکمانی کەم کردووەو ژمارەی عەرەبی بەجۆرێ زیادکردووە بەجۆرێ لەخەملاندنەکەی عێراقدا ژمارەی عەرەب ١٦٦,٩٤١ کەچی لەهی بەریتانیا ٧٦٣ ، ١٨٥ کەسە!

سەبارەت بۆچی تورک و عەرەب پشتیان لەکورد کردو لەسەر ولاتی کوردان کەوتنە ململانێ؛ لەوەلامدا دەڵێین رۆحی فراوانخوازی ئەو دوو نەتەوە بالا دەستە لەلایەک هەروەها بەحوکمی ئەوەی بیری نەتەوە پەرستی عەرەبی و تورکی بیرێکی دوو رەگی و ئیستعمارییە یان وەک بێشکچی و تەنی بیری، ئەو نەتەوانە دوژمنکارن و سروشتی بزوتنەوەکانیان ناوەرۆکێکی ئیمپریالیستی و ئیستعماریان هەیە...[19]

ئەو دوو هۆکارە وای لێکردوون لەسەر ولاتی کوردان-ویلایەتی موسڵ- دەگەڵ یەک بکەونە ململانێ لەو نێوەش غاندنی و تەنی نابێ دەوری ئیستعماری ئینگلیز لەبیربکەین، چونکە نەک ئەگەر دوو نەتەوە

(١٩) د. ئیسماعیل بێشکچی، کوردو مەسەلەی کورد سلێمانی ١٩٩١، ل٤٥.

کێشـەیان هەبێ خەتاکەی لەئینگلیزە، بەڵکو ئەگەر دوو ماسیش لەدەریا بەشەڕبێت ئەوا خەتاکەی هەر ئیمپریالیزمە.

پاش ئەو دەروازەیە بۆ ناسـینی مـوسڵ و کـەمێ لەکـێـشـەکـەی، لەو هۆکـارانە دەکـۆڵینەوە کـە دەوری گرنـگیـان بینیـوە لە لکاندنی ویـلایەتی موسڵ بەعێراقی عەرەبییەوە.

## هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقی عەرەبییەوە

### یەکەم: هۆکاری نێو دەوڵەتی

بەر لەجەنـگی یەکـەمی جیـهـانی کوردسـتـان ببـووە شوێنی ملـملانێی زلهێـزەکـان ئەڵـمـانیا، روسـیا، بەریتـانیـا هەریەکـەی بەجۆرێ دەیەویست بەرژەوەندی یەعـەسکەری، ئابووری، سـیـاسی، (دینی)یەکـانی خـۆی لەناوچەکـەدا فـەراهەم بێنێ، بەڵام کـە جـەنـگ هەڵگیـرسـاو بەشکـسـتی ئەڵـمـانیـاو عـوسـمـانی کۆتایی پێـهـات، لەولاش روسـیـا، بەهۆی کـودەتای بەلشەویەکانەوە، ئەویش بۆ ماوەیەک لەناوچەکە دوورکەوتەوە، هەرچەندە بەپێـی ڕێککەوتنامـەی سـایکس- بیـکۆ، ویلایەتی مـوسـڵ بۆ فـەرەنسـا دانرابـوو لەگـەڵ چەند جـێـیـەکی دی، ویلایەتی بەسـراو بەغـداش بۆ بەریتـانیـا دانرابوون [٢٠] بەریتـانیـا لە ١٩١٤/١١/٢٢ بەسـرای داگیرکرد، لەساڵی ١٩١٥ پاش شەڕێکی خوێناوی بەغدای داگیرکرد، لە ٢٤/ ئۆکـتـۆبەری ١٩١٥ حکومـەتی لەندەن، لەنامـەیەکـدا بۆ شـەریف

(٢٠) ئەو شوێنانەی بۆ بەریتانیاو فەرەنساو روسیا، ئیتاڵیا. دانرابوون، هەریەکە بەبۆنەیەک دیارکرابوو.. بەواتای هەریەک لەفـەرەنسـاو بەریتـانیـا زۆر جـێی دیکەیان بۆ دانرابوو.

حوسێنی میری مەکە، بەڵێنیدا کە ئەو دوو ویلایەتە عەرەبییەی پێ ببەخشێ بەرامبەر بەهاوکاری و پشتگیریکردنی بەریتانیا لەدژی تورکەکان بەریتانیا ئەو بەشەی لەسایکس- بیکۆ بۆی دانرابوو بە زەبری هێز داگیری کرد، هەرچی ئەو بەشەی بۆ فەرەنسا دانرابوو ویلایەتی موسڵ- بەحوکمی ئەوەی سوپای فەرەنسی لەناوچەکەدا نەبوو، بۆیە بەریتانیا دەرفەتی بۆ رەخسا کە نەگوێ بە سایکس- بیکۆ بدات وەنەرێزی ئاگربەسە مۆدۆرۆس بگرێ، لەو پێودانگەوە مەسەلەکە- مەسەلەی لکاندنی ویلایەتی موسڵ- لەبنەرەتدا پابەندبوو بەبەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لەناوچەکەدا، ئالێرەدا هەوڵدەدەین، لەوهۆکارانە بکۆڵینەوە کەوای لەبەریتانیا کرد ویلایەتی موسڵ بەهەردوو ویلایەتی بەسراو بەغدا بلکێنێ:

### ١- هۆکاری نەوت

ولآتی نێوان دووزێ لەدێر زەمانەوە ناسراوە بە ناوچەیەکی دەوڵەمەند بەنەوت، هەندێ نووسەر ئامـاژە بۆ ئەوە دەکەن کە هەتا هیرۆدۆتسی مێژوونووسیش ئاماژەی بۆ ئەو مەسەلە کردووە[٢٢]. بەپێی هەندێ بەڵگەنامەی نهێنی (بەریتانی)- کەتازە ئاشکرا کراون، بەریتانیا هەر لەسەدەی نۆزدەهەمەوە بۆی دەرکەوتووە کە نەوتێکی زۆر لەویلایەتی

---

(٢١) درية عوني، عرب واكراد خصام او وئام، ص٤٧.

(٢٢) كمال مجيد، النفط والاكراد، دراسة العلاقات العراقية، الايرانية، الكويتية، لندن ١٩٩٧، ص١٤.

مــــــوسڵ هەیە[٢٣] بەریتـانیـا ئەو راسـتـیـیـەی لە گـەورە بەرپرسـانی ئیـمپـراتۆریەت و فـەرەنسـای هاو پەیمانیـشـی شـاردبۆوە، کـەرازیش بوو، ویلایەتی مـوسڵ بەپێی سایکس- بیکۆ بدریٚ بەفـەرەنسـا، هەر بۆیەوە بووە کـە فـەرەنسـا ببـێـتـە بەربەرسـتـێک لەنێـوان سنووری دەسـەڵاتی بەریتانیا و هێزەکانی قەوقازو روسیا، هەروەها ئەو تاکتیکەی بەریتانیا توانی فـەرەنسـا دووربخاتەوە لەوەی یەکـێـتـیـیـەک لەگەڵ کـۆمـپـیـانـیـای نـەوتـی تـورکـی TPC پێـکبـهـێـنێ[٢٤] ئەمـەو ئەڵمـانەکـانیـش هەر لەسـەردەمی عـەبدولحـەمـیـدی دووەم خـەریکی دۆزینەوەی نەوت بوون لەناوچەکـەدا، دەیانویست بەشی خـۆیان لەنەوتی ناوچەکـە بەریکەوێ، بەڵام شکستی ئەڵمانیاو عـوسمانیەکـان لەشەڕدا ئەو خەونەی ئەڵمانیا پووچ کـــردەوە.[٢٥] بەڵگەیەکی دی، کە بەریتـانیـا پێش هەڵگیرسـانی جەنگ بڕیاری دابوو سەرچاوەیەکی نەوتی دەست بەسەر دابگرێ، ئەوەیە ونیستن چەرچل لەساڵی ١٩١٣دا وتویەتی:

دەبێ ببین بەخـاوەن نەوت یان هەر هیچ نەبێ دەبێ کۆنـتـرولی ئەوەندە نەوتەی دەمـانەوێ بکەین[٢٦] هەروەها لە نەزەری نـووسـەرێکی دیکەدا عـێـراقی ئەمـڕۆ دەسـتـکردی چەرچل خـۆیەتی چەرچل بۆ ئەوەی هەردو کێڵگە نەوتی لەیەک دووری کەرکـووک و مـوسڵ بەیەک ببەسـتـێـتـەوە، بیـرۆکـەیەکی شـێـتـانەی بۆ هاتووە بەوەی هەرسێ گـروپی کـورد وسـونەو

(٢٣) دریەعونی، سەرچاوەی پێشوو، ص١٤.
(٢٤) سەرچاوەی پێشوو.
(٢٥) هیوا ئەمین، دۆزی ناسیۆنالی تورک، ل٢٥.
(٢٦) دریەعونی، ص٤٦.

شیعە لە دەوڵەتێکدا کۆبکاتەوە[٢٧]. هەر لەوبارەیەوە، پرۆفیسۆر کەمال مەجید دەنووسێ: بوونی نەوت لەکەرکوک سوپای ئینگلیزی هاندا کە ئاگر بەس بشکێنێ و دەست بەسەر هەمــوو ئەو ناوچانە دابگرن کـە دەکەونە باشووری زێی خابوور[٢٨] ئەمەو خودی شاری موسڵ لەسەردەمی ئاگربەسدا هێشتا داگیر نەکرابوو، بەڵام بەحوکمی ئەوی نەوت لەناوچەکە هەبوو هەروەها نزیک بوو لەتورکەکـان، بۆیە ئینگلیز لەرێگای هەردوو بەندی حەوت و شازدەی ئاگر بەسدا[٢٩] هەم شەرعیەتی بەداگیرکردنی موسڵدا هەم سەرەتایەکی دانا بۆ ئەوەی فەرەنسا بەیەکجاری لەناوچەکەدا بێ ئومێد بکات، جا بۆ ئەوەی بەریتانیا «بەرەسمی» فەرەنسای هاو پەیمانی خۆی رازی بکات دەست بەرداری ویلایەتی موسڵ بێ، لوئید جۆرجی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا لەکانوونی یەکەمی ١٩١٨ لە لەندەن لەگەڵ کلیمانسۆی سەرۆک وەزیرانی فەرەنسا کۆبۆوە، فەرەنسا نەیدەزانی ویلایەتی موسڵ هێندە گرنگە بۆیە بەسێ مەرج رازی بوو دەست بەرداری موسڵ بێ ١- فەرەنسا بەشە نەوتی خۆی لەموسڵ دەست بکەوێ، ٢- بەریتانیا تەواو پاڵپشتی فەرەنسا بکا لەدژی لاری بوونی ئەمەریکا لەوبارەیەوە، ٣- ئەگەر کار بە سیستەمی ئینتداب کرا، ئەوا دەبێ

(٢٧) د. عبدالفتاح بوتاني، مدرسة ١١اذار...: اربيل ١٩٩٩، ص١٧.
(٢٨) كمال مجيد، سەرچاوەی پێشوو، ص١٤.
(٢٩) بەپێ بەندی حەوتەم هاوپەیمانەکان مافی ئەوەیان هەبوو کە ئەگەر پێویست بوو، هەموو شوێنە ستراتیژیەکان داگیربکەن. بەپێی بەندی شازدەهەمین دەبوو عوسمانیەکان حامیەو پێگە سەربازییەکان لەعێراق و سوریا و حیجاز.. تەسلیم بەنزیکترین سەرکردەی هاوپەیمانەکان بکەن.. بڕوانە فاروق الحريري: الحرب العظمى، ص٣٢٤-٣٢٥.

دیەشق، حەلەب و ئەسکەندەرونەو بەیروت لەژێر ئینتـدابی فـەرەنسی دابێ[30] ئەوسا کلیمانسـۆ نرخی ئەوەی نەدەزانی کەبە بەریتانیادا دابوو، بەلاّم کـەزانی لەدەسـتـدانی ویلایەتی مـوسڵ زیانێکی زۆرگـەورەیە بۆ بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا ئەوا لە ٢٢/مایسی ١٩١٩ بەلوئید جورجی وت: ئەگەر بمزانیـابا ئەو شتە ئەوەندە بەنرخە، ئەوا قەت دەست بەرداری نەدەبووم[31] هەرکە فەرەنسا زانی نەوت لەموسڵ هەیە، ڕێککەوتنامەی لوئید- کلیمانسۆی رەتکردەوەو لەگەڵ بەرتیانیا جارێکی دی لەسەر ئەو مەسـەلەیە کـەوتە دانوسـتـاندن تا ڕێککەوتنامـەی سـان ڕیمۆیان لە ٢٣/٤/١٩٢٠مۆرکرد[32] هەروەها جارێکی دی ئەو ڕێککەوتنامەشیان لە دیسەمـبەری ١٩٢٠ هەمـوارکرد تا لەئاکام بەریتـانیـا رازی بوو بەشە نەوتی ئەڵمانیا بداتە فەرەنسا، بەریتانیا کە کێشەی فەرەنسای لەبارەی نەوتی ویلایەتی موسڵ لەکۆڵ بۆوە، ڕووبەڕووی کێشەی تورکەکان بۆوە.

لەقـۆناغی دبلۆمـاسـیـەتی بەریتـانیـا دەگـەڵ تورکـان لەسـەر ویلایەتی مـوسڵ، دەبێ ئاماژە بەڕۆڵـی لۆرد کیـرزۆن بکرێ، کیـرزۆن باوەڕی وابوو کـە هاوپەیمانەکـان (بەریـتـانـیـا) لەسـەر دەریایەکی نەوتەوە بەسـەرکـەوتن گـەیشـتـوون [33]، بۆیە ئاسـان نـیـیـە دەست بەرداری ئەو ناوچەیە ببن، کـیـرۆزۆن «زیرەکـانە» توانی «عـصـمت ئینو سـەرۆک وەفـدی تورکـیـا بۆ کێشەی ویلایەتی موسڵ رازی بکات کە ئەو کێشەیە دوو قۆڵی چارەسەر

(٣٠) د. فاضل حسین، مشكلة الموصل، بغداد ١٩٩٧، ص ٨-٩.
(٣١) سەرچاوەی پێشوو، ص٩.
(٣٢) دریەعونی، سەرچاوەی پێشوو، ص٤٥.
(٣٣) کمال مجید، سەرچاوەی پێشوو، ص٢٠.

بکەن، د. میم کەمال باوەڕی وایە کە ئەو رازی بوونەی ئینۆنۆ، هەڵوێستی بەریتانیای بەهێزکرد بۆ ئەوەی مەسەلەی موسڵ ویلایەتی بەبەرژەوەندی بەریتانیا تەواو بێ[٣٤] ئەمەو وەنەبێ بەریتانیا دەگەڵ عەرەبەکانی عێراقیش ساخەبووبێ، پاش ئەوەی کۆمیتەی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵەی گەلان بەکاریگەری راستەوخۆی بەریتانیا- بڕیاری لکاندنی ویلایەتی موسڵی بەعێراقی عەرەبیدا، دوو مەرجی لەگەڵ بڕیارەکە دانا:

١- عێراق بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ لەژێر ئینتداب بێ.

٢- دەبێ ویست و ئارەزووی کوردان لەبەرچاو بگیرێ زمانی کوردی رەسمی بێ لەدادگاو قوتابخانەکان..

بەریتانیا ئەو بڕیارەی بەسەر پەرلەمانی عێراقیدا سەپاندو پێی وتن ئەگەر رازی نەبن بەو بڕیارە، ئەوا بەریتانیا ناچار دەبێ ویلایەتی موسڵ بەتورکیا بداتەوە، لەئاکام پەرلەمانی عێراقی رازی بوو بەوەی ویلایەتی موسڵ ببێ بەبەشێک لەعێراق هەروەها لەژێر گوشاری بەریتانیا رازی بوو عێراق بکەوێتەوە ژێر راسپاردە و ئینتدابی بەریتانی.

## دووەم: هەڵکەوتەی جیۆپۆلیتیکی ویلایەتی موسڵ

زۆربەی ئەو سەرچاوانەی لەسەر کێشەی ویلایەتی موسڵ- یان نووسیوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە لەکاتی مۆرکردنی ئاگربەسی مۆدرۆس لە ١٩١٨/١٠/٣٠، سوپای ئینگلیز هێشتا دوازدە میل

34- Dr. mim kemal, 1991, A chronology of Mosul Question.

لەشاری موسڵ دوور بووە[٣٥] سووربوونی ژەنیراڵە عەسکەرییەکانی ئینگلیز لەسەر داگیرکردنی موسڵ خۆی لەخۆیدا دەگەڕێتەوە بۆ هەڵکەوتەی ستراتیژی ئەو ناوچەیە چ لەڕووی ئابوورییەوە کە ناوچەیەکی دەوڵەمەندی نەوتییە هەروەها ئەو دەڤەرە بۆ ئینگلیز خۆی لەخۆیدا زیاتر زەمانەتی تەناهی، موستەعمەراتی ئینگلیزی لەناوچە عەرەبییەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا دەگەیاند. هەروەها لەنەزەری بەریتانیا ویلایەتی موسڵ ئەوسا ڕێگای بەستنەوەی نێوان قاهیرەو کلکتا بووە جا بۆ گەرەنتی کردنی ئەم ڕێگایە، دەبوو بەریتانیا ویلایەتی موسڵ داگیر بکات، بەم داگیرکردنەش بەریتانیا دەیتوانی ئیمپراتۆریەتەکەی بپارێزێ و هەر بەریتانیای مەزن بمێنێتەوە[٣٦]. ئەمەو کۆنترۆڵکردنی ویلایەتەکە، بۆ ئینگلیز بەربەستێکی مەزنی لەبەردەم پێشڕەوییەکانی رووس و قەوقازییەکان دروست دەکرد.

مێجەر نوئیل باوەڕی وابوو، کە کوردەکان دەبنە بەربەستێکی مەزن لەنێوان میزۆپۆتامیای عەرەبی و کێشە سیاسییەکانی قەوقاز هەربۆیە لەنەزەری نوئیل کوردەکان زیاتر دەتوانن بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لەو ناوچەیە بپارێزێن، هەروەها نابێ ئەمەش لەبیربکەین کە ویلایەتی موسڵ دەگەڵ شام و بەغداو تورکیا و وڵاتی فارس-یش هاو سنوورە ئەم هاو

---

(٣٥) بڕوانە، فاضل حسين مشكلة الموصل، مصير ولاية الموصل، خالد دلير، كيف الحقت كردستان الجنوبية- د. عزيز شمزين، جولانەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی کوردستان، دريةعوني، عرب والاكراد.

(٣٦) درية عوني، ص٤٤.

---

سنوورییەش دەگەڵ ئەو سێ نەتەوەیە تورک، عەرەب، فارس، هۆکارێکی دی بووە وای لەبەریتانیا کردووە کە بیر لەوە بکاتەوە هێندە باوەڕی بەهێزی عەرەبەکانی ویلایەتی بەغداو بەسرا نەبێ- بەواتایەکی دی، دەوڵەتێکی عەرەبی لەعێراقدا بێ ویلایەتی موسڵ لەڕووی ئابووری و جوگرافیاوە لەخەتەر دابوو و بەرژەوەندییەکانی بەریتانیای لەناوچەکەدا پێ نەدەپارێزرا هەربۆیە هەروەک لەگفتوگۆو نامەکانی سەرکردەکانی ئینگلیز لەناوچەکدا دەردەکەوێ ئەوان هەر هەموو سوور بوون کە ویلایەتی موسڵ لەژێر دەستی ئینگلیز دابێ[٣٧].

### سێیەم: ڕۆڵی کێشەی مەزهەبی لەلکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقی عەرەبییەوە

لەبەشە عێراقی عەرەبیدا ئەو عەرەبانەی بەمەزهەب شیعەن، چوارقاتی عەرەبەکانی ناوەندی عێراق پێکدێنن[٣٨] عەرەبە شیعەکان کە زۆربەی هەرەزۆری شارەکانی باشووری عێراق پێکدێنن هەروەها لەهەندێ شارەکانی ناوەندی عێراقیشدا هەن بەتایبەتی بەغدا، بەریتانیا لەشەڕی کوت (١٩١٥) بەدەست شیعەو کوردەوە دوچاری شکستێکی گەورە بوو، هەروەها بۆ داگیرکردنی بەغداش، هەندێ سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئینگلیز (٩٨٠٠٠) کەسی لێ کوژراوە[٣٩] لەشۆڕشی ١٩٢٠یش دووبارە سوپای ئینگلیز دوچاری سەرئێشەیەکی مەزن بوو بەدەست

(٣٧) طارق جامباز، چرچل و کوردو خوارووی کوردستان لەچەند دۆکیومەنتێکی وەزارەتی دەرەوەی ئینگلستاندا، کاروان ژمارە (١٢) ١٩٩٤، ل٢٢-٢٣.
(٣٨) ڕەفیق صابر، ڕۆڵی کێشەی مەزهەبی لەلکاندنی کوردستانی خواروو بەعێراقەوە گۆڤاری نۆژەن، ژمارە (٢) ل٥١.
(٣٩) کمال مجید، ص١٤.

شیعەکانەوە ئەو شیعانە ئەو هەموو بەرگرییەیان لەدەسەڵاتی ئیتحادیە عوسمانییەکان دەکرد، کەچی لەنەزەری ئەوان، ئەو شیعانە هاوڵاتی نارەسەن بوون[٤٠] (نا عوسمانی). هەرچی عەرەبەکانی ناوەندی عێراق بوون، ئەوا بەحوکمی ئەوەی لەچاو شیعەکان (لەڕووی مەزهەبەوە) ئەقەلییە بوون ئەوا هەردەم دەگەڵ هێزی دەسەڵاتدابوون ئەو عەرەبانەی ناوەندی عێراقی ئینگلیز ناوی نابوون عەرەبی سونە- ئەمە هەر بۆ جیاکردنەوەی مەزهەبی بوو نەک مەسەلەیەکی دی- ئەوانە دەگەڵ ئینگلیز دەسازان و ئامادەبوون «فەیسەڵ»ێکی نا عێراقی بەپادشای خۆیان بزانن، هەروەها حکومەتەکەیان بێ یەک و دوو لێکردن بەپلانی سێر پیرسی کۆکس رازی بوو بەوەی سیاسەتی دەرەوەو ئابووری و نەوتی عێراق بەدەست ئینگلیز بێ.[٤١] ئینگلیز دەیزانی شیعەکان لەژمارە چوارقاتی عەرەبەکانی ناوەندی عێراقن، هەروەها دەیزانی ئەو شیعانە دەگەڵ ئێرانییەکاندا هاوسۆزییەکی مەزهەبی قووڵیان هەیە، هەروەها ئینگلیز وەک «هێزێکی ئیمپریالیزمی» دەیزانی ئاژاوەی مەزهەبی لەنێوان گەلانی عێراقدا هەیە هەروەها باوەڕی وابوو کە عەرەبەکانی ناوەندی عێراق کە تەنها لە ١٥٪ دانیشتوانیان پێکدەهێنن ناتوانن بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لەناوچەکە لەبەرامبەر کوردو شیعەکان بپارێزن، هەربۆیە چەرچلی وەزیری موستەعمەراتی ئینگلیز بیرۆکەی ئەوەی بۆ هات کە بۆ پاراستنی هاوسەنگی کوردو عەرەبی سونەو شیعە

---

(٤٠) رفیق صابر، سەرچاوەی پێشوو.
(٤١) کمال مجید مصدر سابق، ص١٤.

---

لەدەوڵەتێکدا کۆبکاتەوە،[42] لەسەر ئەو بنەما مەزهەبییە کوردەکانی ویلایەتی موسڵ کە ئەوسا لە ٢٨ ٪ عێراقییان پێکدەهێنا، ئینگلیز وەک پاڵپشتێک بۆ عەرەبەکانی ناوەندی عێراق، وڵاتەکەیانی کردە بەشێک لەعێراق.

## دووەم: هۆکاری ناوخۆ

ناتوانرێ نکۆڵی لەوەبکرێ کە هەریەک لەزلهێزەکانی ئەوسا پێشتر لەڕێگای ڕێککەوتنامەی سایکس- بیکۆ بڕیاری دابەشکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییان دابوو، بەڵام ئەم پرسیارەی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە ئەوەیە ئاخۆ لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقی عەرەبییەوە هۆیەکەی سەدلەسەد دەگەڕێتەوە بۆ ئینگلیز؟! ئێمە وتمان هۆکاری نەوت و جیۆپۆلیتیکی کوردستان هەروەها مەسەلەی مەزهەبیش کاریگەری خۆیان هەبووە لەلکاندنی کوردستانی خواروو بەعێراقەوە، بەڵام نابێ ئەوەش لەبیربکەین کە هەندێ دۆکیۆمەنتی بەریتانی جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە هەندێ لەسەرکردەکانی ئینگلیز لەناوچەکەدا لەگەڵ ئەوەبوونە کوردەکانی ویلایەتی موسڵ هەرچ نەبێ، «ئۆتۆنۆمی» یان پێبدرێ هەروەها وەک دەزانین بەریتانیا پێش ئەوەی فەیسەڵ بە پادشای عێراق دابنێ، شێخ مەحمودی بە (حکمداری کوردستان ناسی بوو[43] هەروەها هەریەک مانگ دوای ئەوەی ئینگلیز دانی بەحوکمداری شێخ مەحمود لەسلێمانی

---

(٤٢) د. عبدالفتاح بوتانی، ص١٧.
(٤٣) ڕەفیق حیلمی، یاداشت، بەشی یەکەم، ل٦١.

دانا ، لەشاری بەغدا رۆژنامەیەکی حەفتانەی بەناوی «تێگەیشتنی» راستی بڵاوکردەوە[٤٤] هەروەها مێجەرسۆنی حاکمی سیاسی سلێمانی حەفتانەمەی «پێشکەوتن»ی لەسلێمانی دەرکردو توانی زۆر لەکوردە نیشتمان پەروەرەکانی سلێمانی لەدەورەی ئەو حەفتەنامەیە کۆبکاتەوە،[٤٥] لەکارنامەی کۆنگرەی قاهیرەش، باسی مەسەلەی کورد، بەتایبەتی ویلایەتی موسڵ بەمجۆرە خرایەڕوو:

یەک: ناوچە کوردییەکان ببەسرێن بەعێراقەوەو بەبەشێک لەحوکمەتی عێراقی بژمێردرێن.

دوو: یاخود لایەنگری جیابوونەوەو سەربەخۆیی کورد بکرێت[٤٦] سەبارەت بەو دوو مەسەلەیە چەرچل و پرسی کۆکس و سۆن و یۆنگ و نوئیل هەریەکەی رایەکی هەبوو- بەواتای هەموو تەبا نەبوون نەلەسەر تەواو لکاندنی ویلایەتەکە بەعێراقی عەرەبییەوە نەتەواو رازی بوون دەوڵەتێکی کوردی هەبێ، چەرچل باوەڕی وابوو کە ناوچە کوردییەکان راستەوخۆ لەژێر چاودێری ئیدارەی ئینگلیز بێ نەک عەرەبەکان هەروەها نوئیل کە هەندێک بەلۆرانسی کوردان ناوی دەبەن، دەگەڵ ئەوە دابوو کە سنوورێکی جیاکەرەوە لەنێوان کوردو عەرەبدا هەبێ[٤٧] هەروەها لەهەمووش گرنگتر هاوپەیمانەکان بەگوێرەی پەیمانی سیڤەر رازی بوون کە

---

(٤٤) جەمال خەزنەدار، سەرهەڵدانی رۆژنامەگەری کوردی، گۆڤاری هاڤیبون، ژمارە (٤) ١٩٩٨.

(٤٥) گۆڤاری هاڤیبون ژمارە (٤) ل١٥٤-١٥٥.

(٤٦) طارق جامباز، سەرچاوەی پێشوو ل٢٢.

(٤٧) سەرچاوەی پێشوو.

لەماوەی ساڵێکدا دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێ.

ئالێرەدا راستە ئەو هەموو خۆ نزیک کردنەوەی ئینگلیز لەکوردەوە تاکتیک بوو هەمووی پابەند بوو بەسەر رەوتی رووداوەکاندا بەتایبەتی جولانەوەی کەمالییەکان هەروەها هەڵوێستی سەرکردەکانی کورد لەکەمالییەکان و ئینگلیز. حکومەتی ئەستەمبۆڵ، پەیمانی سیڤەری مۆرکردبوو، بەڵام هەرچی کەمالییەکان بوون ئەوا «سیڤەر»یان بەسێدارەی تورکیا دەزانی، بۆیە سەرکەوتنی کەمالییەکان بەسەر یۆنانییەکان و حکومەتی ئەستەمبۆڵ وای لەئینگلیزکرد ناچاربێ لەگەڵ کەمالییەکان دابنیشێ.

هەرچی سۆڤیەت و فەرەنساو ئیتالیا بوون هەریەکەی لەپێناوێک (هەندێکیان هەر لەدژی دەسەڵاتی بەریتانیا) پاڵپشتی کەمالییەکانیان دەکرد، لەو نێوەش کوردەکانی باکوورو باشوور تەواو کەوتبوونە ژێر دیاگۆژیەتی تورکەکان، سەرکردە کوردەکانی ئەوساش هەریەکەی بەجۆرێ لەمەسەلەکەی دەروانی: شێخ مەحمود لەنێوان بەرداشی تورکە جل خوارەکان و ئینگلیز ویستەکاندا نەیدەزانی خۆی بەتەواوی بەلای کێدا ساخ بکاتەوە، ئەمەو وەک ویلسن خۆی نووسیویەتی (شێخ مەحمود تا دوێنێ لەگەڵ روسەکاندا کە بەڵێنییان پێدابوو دژی سوپای تورکیا پشتیوانی لێبکەن، وتووێژی دەکرد)[48] لەپاشان وەک رەفیق حیلمی دەنووسێ شێخ بەنهێنی نامەی بۆ ویلسن نووسیوە و ئامادەیی خۆی

---

(٤٨) د. عزیز شەمزینی، جولانەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی کوردستان، ١٩٩٨ ل١٥٤.

دەربڕیوە کە حکومەتێکی کوردی لەژێر چاودێری بەریتانیا دابمەزرێنێ[٤٩] لەپاش ئەوەی شێخ مەحمود لەسۆڤیەت و ئینگلیز بێ ئومێد بوو وەک د. کەمال مەزهەر دەنووسێ: شێخ لەڕێگای ئۆزدەمیرەوە بەنهێنی پەیوەندی بەتورکەکان کردبوو، بەڵام دیاربوو کەمالییەکان لەگەڵ شێخ دەستپاک نەبوون، بەڵکو دەیانویست بیکەنە داش دامەی جێبەجێکردنی مەبەستی خۆیان[٥٠] ئەمەو وەنەبێ تورکەکان بەدیماگۆژیەتی خۆیان توانیبێتیان هەر تەنها پەیوەندی نێوان شێخ مەحمود و ئینگلیز ئاڵۆزتر بکەن، بەڵکو زۆر لەسەرکردە عەسکەری و عەشایەرییەکانی کوردستانی باکووریشیان بەناوی برایەتی «تورک و کورد» فریودابوو بۆ ئەوەی ئەوانیش لەدژی ئینگلیز و سیاسەتی ئینگلیز لەناوچەکەدا دژە هەڵوێست بنوێنن، لەو نێوەش، پاش ئەوەی ئینگلیز بۆی دەرکەوت، کەشێخ مەحمود ئەو کەسە نییە متمانەی پێبکرێ، لەسەرکردەیەکی دی دەگەڕان کەبتوانی ببێ بەبەدیلی شێخ مەحمود، ئەفسەرە سیاسییەکانی ئینگلیز لە ناوچەکەدا وایان پێشنیارکرد کەسەید تەهای شەمزینی ئەو بەدیلەبێ، چونکە سەید تەها ئامادەبوو دەگەڵ ئینگلیز هاوکاری بکات هەرچەندە، سەید تەها دەگەڵ سەرکردەکانی ئینگلیز وتوێژی کرد، بەڵام دیاربوو ئینگلیز تەواو باوەڕی بەسەید تەها نەبوو هەربۆیە لە پاشان هەر ئینگلیز خۆی سەید تەهای بەدەست ڕەزا شا بەکوشتندا[٥٢].

(٤٩) رەفیق حیلمی و یاداشت، بەرگی یەکەم، ل٥١.
(٥٠) د. کەمال مەزهەر کۆمەڵەی گەلان، گۆڤاری کاروان ژمارە (١٧) ل١٥.
(٥١) بڕوانە، د. شەمزینی، ل١٥٥، هەروەها د. میم کەمال، کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی موسڵ.
(٥٢) سەرچاوەی پێشوو ل١٥٦.

بەمجۆرە رەوشی رووداوەکان لەنێوان ئینگلیزو تورک و کوردا بەرەو تەواو جێبەجێکردنی ستراتیژیەکانی ئینگلیز لەناوچەکەدا دەچوو، هەرچی عەرەبەکانی عێراقیش بوون ئەوا لەژێر سایەی نیزامی ئینتدابی بەریتانیدا چەندەها پارتی سیاسیان پێکهێنا وەک پارتی نیشتمانی عێراقی، پارتی ئازادی عێراقی، پارتی پێشکەوتن، پارتی گەل، پارتی برایەتی نیشتمانی، کۆمەڵەی ئەهالی[53] بەحوکمی ئەوەی ئەو پارتانە لەسەر بنەمای دەمارگیری نەتەوەیی دامەزرابوون، ئەوا مەسەلەی لکاندنی ویلایەتی موسڵیان بەعێراقی عەرەبی بەشتێکی سروشتیان دەزانی، چونکە ئەوان باوەڕیان وابوو کە ئەو ویلایەتە خۆی لەخۆیدا بەشێک لەخاکی عێراقی دەنوێنێ[54] ئەمەو هەروەک وتمان ئەو ئەقلییەتە دەسەڵاتدارەی عەرەبی ناوەندی عێراق لەپێناو مانەوەی خۆی ئامادەبوو هەموو بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بپارێزێ، هەرچی تورکیاش بوو پاش ئەوەی بەفەرمانی لۆرد کیرزۆن نیزامی خەلافەتی هەڵوەشاندەوە و دەستی کرد بەعەلمانی کردنی دەستووری تورکیا، بەرژەوەندی ئینگلیز وای خواست، پشت لەکورد بکات، لەو نێوەش نەک تورک و عەرەب بەکەڵکی کورد نەهاتن، بەڵکو ئینگلیز وەی لێکردن دەگەڵ یەک هەردەم لەکێشە دابن.. بۆ پاراستنی هاوسەنگی هێزەکانیش، ئینگلیز لەپێناو

---

(٥٣) د. عبدالفتاح بۆتاني، موقف الاحزاب السياسية العراقية من القضية الكردية ١٩٤٦-١٩٧٠، اربيل، ١٩٩٨، ص١١.

(٥٤) محمد سەلام، شۆڤینیەت لەمپەرە لەبەردەم چارەسەری مەسەلەی کورددا، گۆڤاری مەتین ژمارە (٧٢).

بەرژەوەندییەکانی هیچ کاتێ لەلێدانی بزاڤی رزگاریخوازی کورد درێغی نەکرد، هەرەسی شۆڕشەکانی شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەد بارزانی و سمکۆ و شێخ سەعید بەڵگەی بەشداری ئینگلیز لەدژی کورد دەردەخەن.

## پوختەی باسەکە

لەم نووسینەدا بەکورتی مێژووی ویلایەتی موسڵ خراوەتەڕوو جەخت لەسەر ئەوکراوە کە ئەو ناوچەیە بەشاهێدی مێژوو نووسەکانی ئیسلامی و بیانی کۆن ولاتی کوردانە، هەروەها لەم نووسینەدا لەو هۆکارانە کۆڵدراوەتەوە کە دەوری گرنگیان هەبووە لەلکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقی عەرەبییەوە، نووسەر گەیشتۆتە ئەو قەناعەتە هەرچەندە فاکتەری نەوت و جیوپۆلیتیک و مەزهەبی دەوری خۆیان هەبووە لەمەیسەربوونی ئەو پرۆسە ئیمپریالییە، بەڵام نووسەر ئەمەشی دەرخستووە کە فاکتەری ناوخۆش دەوری خۆی هەبووە وەک کێشەی نێوان سەرکردەکان و تێگەیشتنییان هەروەها دەوری تورک و عەرەب لەفریودانی سەرانی کورد.

# بەشی پێنجەم

# کۆنگرەی قاهیرە و مەسەلەی کورد

**• دەروازەیەک پێش چوونە نێو باسەکەوە:**

ئاگــــر بەسی مـــۆدۆرۆس، کـــە لە ۱۹۱۸/۱۰/۳۰ لە نێـــوان هاوپەیمانەکـــەمـــان و دەولەتی ئۆسمـــانی مـــۆرکـرا، واتای دەس بەرداری ئۆسمانی یەکانی دەگەیاند، ئینگلیز لە مێژ بوو چاوی بری بووە کێڵگە نەوتی یەکانی ولاتی نێـوان دووزێ. بە قـەولی چەرچل دەبوو ئینگلیـز هەرچۆنێ بێ ژێدەرێکی نەوتی بەدەست بێنێ[1]، هەروەها کـیـرزۆنیش باوەڕی وابوو کـە هاوپەیمانەکـان (ئینگلیـز) لەسـەر دەریایەکی نەوتەوە بەسەرکەوتن گەیشتـون[2]. هۆکاری نەوت لەناوچەکەدا بەگشـتی پالی بەئینگلیـز وەنا هەتا ڕێز لە پەیمانی سایکس بیکۆ و ئاگربەسی مۆدۆرۆس نەگـرێ و بەزۆری لە ۱۹۱۸/۱۱/۸ شـاری مـوسڵ داگـیـربکا و ئالای ئۆسمانی بێنیتە خوارەوە و ئالای بەریتانی هەڵکا. ئینگلیز بۆ ئەوەی ئەو کـارەی بۆ مـەیسـەربێ و کـورد و شـیـعـە و سـونە لە دەولەتێکدا کـۆبکاتەوە[3]، سـەرەتا هەوڵی دا فـەرەنسـا رازی بکا دەس بەرداری

(۱) درية عەونی، عرب واكراد خصام ام وئام، دار الهلال، ۱۹۹۲، ص٤٦.

(۲) كمال مجيد، النفط والاكراد دراسة العلاقات العراقية - الايرانية - الكويتية، لندن ۱۹۹۷، ص۲۰.

(۳) د. عبدالفتاح بوتاني، مدرسة ۱۱ آذار...، اربيل ۱۹۹۹، ص۱۷.

ویلایەتی مـوسڵ بێ، لە ئاکـامـدا لوئیـد جـۆرج بەزیرەکی خـۆی تـوانی کلیـمـانسـۆ رازی بکات دەس بەرداری ویلایەتی مـوسڵ بێ. لەسـان ریمۆ ئەو مـەسەلەیە دەگەڵ فـەرەنسـا یەکلاکـرایەوە[٤]. لـەلایـەکـی تـریـش بـۆ دەستەمۆکردنی کوردان، ئینگلیز مێجەر نوئیلی لەگەڵ دەستەیەک هەنارده سلێـمـانـی بۆ ئەوەی بەرواڵەت بەکـوردان بڵێ «ئینگلیـز شێخ مـەحـمـوود بەحـکـمـداری کـوردسـتـان دەناسێ»[٥]. پێـشـتـریش ئینگیـز هەر دەگـەڵ داگیـرکردنی بەسرا و بەغـدا بەڵێنی بە شـەریف حسـێنی ئەمـیری مـەکە دابوو کـە ئەو دوو ویلایەتە لـەبەرامـبـەر هاوکـاری عـەرەب بـۆ بەریتـانیـا لەدژی تورک وەک دیاری بە شـەریف حسێن بدات[٦]. بەڵام لەبەر ئەوەی ئینگلیزەکان سیاسەتێکی ئێزدواژیانەیان بەکار دەهێنا و لە حوکم کردنی ولاتدا لە ئۆسمانی یە ئیـتحادیەکان باشتر نەبوون، بۆیە هەر لە مـانگی نیـسـانی ١٩١٩ لەزاخـۆ وە کـورد دژ بە ئینگلیـز راپەرین تا لەئاکـام راپەرین سلێمانیشی گرتەوە[٧]، ئەو ساڵە ساڵی ١٩١٩، لەکوردستان بۆ ئینگلیز ساڵی نیگەرانی بوو[٨]، چونکە لەو هەموو راپەرینانەدا چەندەها حاکمی سیـاسی ئینگلیز لە کوردستان کوژران وەک کاپتن پیرسن، کاپتن ئوللی. کاپتن سکۆت، کاپتن بێل[٩]. هەرچی عەرەبەکانی عێراقیش بوون

(٤) انظر: د. فاضل حسين، مشكلة الموصل، بغداد، ١٩٧٧، ص٨٠٩.
(٥) رفیق حلمی، یاداشت، هەولێر ١٩٨٨، ل٦١.
(٦) دریە عونی، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧.
(٧) بروانە: د. عـزیز شـەمـزینی، جـولانەوەی رزگـاری نیـشـتـمـانی ی کـوردسـتـان، سلێمانی ١٩٩٨، ل١٥٤.
(٨) کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی موسڵ، وەرگێرانی لە ئینگلیزی یەوە سەلام، ل١٨.
(٩) د. شەمزین، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٥-١٥٨.

بەتایبەتی شیعەکان لە ساڵی ١٩١٨ راپەرینێکی چەکداریان لە شاری نەجەف دژی دەسەلاتی بەریتانیا لە عێراقدا هەڵگیرساند کە زۆربەی ناوچەکانی فوراتی نێوینی گرتەوە. هەروا راپەرینی چەکداریی ساڵی ١٩٢٠ کە بەشۆرشی (گەلی عیراق) ناودەبرێ لەبنەرەتدا راپەرینی خەڵکی شیعەبوو رابەرە ئایینی یەکانی شیعە سەرکردایەتییان دەکرد[١٠]، ئینگلیز بەزەبری هێز راپەرینەکانی کورد و شیعەی سەرکوت کرد. ئەمە و لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ کۆمیسیاری باڵا لە بەغدا داوای لە عەبدولرەحمانی نەقیبی پیا وماقوڵی بەغدا کرد کە حکومەتێکی عەرەبی لەژێر راسپاردەی بەریتانی دابمەزرێنێ. دامەزراندنی حکومەتی عێراقی عەرەبی خۆی لە خۆیدا سەرەتایەک بوو بۆ بەلکاندنی کوردستانی خوارروو بەعێراقەوە. بۆ مەیسەرکردنی ئەو کردارە ئیمپیریالی یە، ئینگلیز بیری لەوە کردەوە کە میرێکی عەرەبی (سونی) بکا بە پاشای عێراق. بە حوکمی ئەوەی شەریف حسێن لە رێگای لۆرانسی عەرەبەوە پالپشتی تەواوی ئینگلیزی کرد، بۆیە ئینگلیز وای بەچاک زانی کە میر فەیسەل کوری میر شەریف حسێن بکا بە پاشای عیراق، هەر لەو بارەیەوە چەرچل بۆ حکومەتی لەندەن دەنوسێ کە ئەو دەگەڵ فەیسەل ووتوێژی کردووە، و توانیەتی فەیسەل رازی بکات کەببێ بەپادشای عێراق[١١]. ئینگلیز باوەری وابوو کە کارێکی وا پێویستی بە کۆنگرەیەک هەیە، هەربۆیە پاش وتووێژەکانی لەندەن، بریار هاتە دان کە لەو بارەیەوە کۆنگرەیەک

(١٠) رەفیق سابیر، رۆلی کێشەی مەزهەبی لەلکاندنی کوردستانی خوارروو بە عیراقەوە، گۆڤاری نۆژەن، ژمارە (٢) ١٩٩٢، ل٥٢.
(١١) کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی موسل، سەرچاوەی پێشوو.

لەشاری قاهیرەی مسری ببەسترێ.

## کۆنگرەی قاهیرە و مەسەلەی کورد

پێش ئەو کۆنگرەیە، کۆمیتەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بە سەرۆکایەتی لۆرد کیرزۆن لە ۱۹۲۱/۲/۲۳ کۆبونەوەیەکی لەبیرۆی وەزارەتی دەرەوە سازدا. لەو کۆبونەوەیەدا سێ ئەلتەرناتیڤ خرابوونە ڕوو:

(۱) موسڵ بلکێندرێ بە عێراق..

(۲) ئینگلیز لە موسڵ بکشێنەوە (ئەو ڕایە وەزارەتی دەرەوە پێشنیاری کرد).

(۳) کۆنفیدرالی یەکی کوردی دابمەرزێ (وەزارەتی دەرەوەی هیندستان ئەو راسپادەیەی دا)[۱۲].

ئەمەو، بەر لە کۆنگرەی قاهیرە، ئینگلیز لە ناوچەکەدا ڕووبەڕووی زۆر گرفت ببۆوە راپەرینەکانی کورد لە کوردستانی خواروو هەروەها راپەرینەکانی شیعە لە باشوور و ناوەندی عیراق و هەروەها گەشەکردنی بزاڤی کەمالی یەکان لە ئەنادۆل هەروەها لە هەندێ بەشی کوردستانی خواروو ئەوانە بەشێک لەو گرفتانەبوون. هەرچەندە ئینگلیز توانی بووی حکومەتێکی عێراقی بەسەرۆکایەتی عەبدولرەحمانی گەیلانی دابمەزرێنێ، بەلاّم بە حوکمی ئەوەی ئینگلیز دەیەویست نیزامێکی پادشایی لە عێراقدا دروست بکات، بۆیە ئینگلیز لە میرێکی عەرەبی سوونی دەگەڕا کە بیکا بە پادشای عێراق و لەو ڕێگایەوە بەهۆی نیزامی ئینتداب بەرژەوەندی یەکانی خۆی لە ناوچەکەدا بپارێزێ. بۆ ئەو

---

(۱۲) سەرچاوەی پێشوو.

مەبەستەش ئینگلیز راپرسیێکی گشتی ئەنجامدا، چوار کەس پالیۆدران کە ئەمانە بوون: هادی پاشا عومەری، یەکێ لە خانوادەی دەسەڵاتداری لە مصر، یەکێ لە کوڕەکانی شەریف حسێن، عەبدولرەحمان گەیلانی نەقیبی پیاوماقوڵانی بەغدا. ئەوسا ویلسنی حاکمی عێراق دەگەڵ ئەوە نەبوو کە فەیسەل بکرێ بە پاشای عێراق[13] بەڵام پاش ئەوەی ویلسن گۆڕدرا وسێر پیرسی کۆکس جێ ی گرتەوە، ئەوەی دواوە پالپشتی فەیسەلی دەکرد، لەنێوان ئەو هەموو گرفتانە، وینستن چەرچلی وەزیری موستعمەراتی ئینگلیز بەپێویستی زانی کۆنگرەیەک لەبارەی چارەنووسی عێراقەوە سازبدرێ. بۆ ئەو مەبەستە چەرچل داوای لە نوێنەرە سیاسی و عەسکەری یەکانی بەریتانی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست کرد کە لەقاهیرە کۆببنەوە. ئەوە بوو لە ١٩٢١/٣/١٢ بە بەشداری چل کەسایەتی یاخود وەک چەرچل وتەنی «٤٠ دز» کۆنگرەیەک لە قاهیرە سازدرا و کۆنگرەکە بە کۆنگرەی قاهیرە نێونرا[14]. کۆنگرەکە لەچوار باسی سەرەکی کۆڵیەوە:

١- کەمکردنەوەی خەرجی بەریتانی گەورە لە عێراق.

٢- باسی ئەوانەی خۆیان بۆ تەختی پاشای عێراق پالاوتووە.

٣- مەسەلەی کورد.

٤- لەشکری داهاتووی عێراق[15].

ئەمەو بەحوکمی ئەوەی تەوەرەی باسەکان لەسەر چارەنوسی عێراق

---

(١٣) ابراهیم خلیل احمد، ولایة الموصل دراسة في تطوراتها السیاسیة (رسالة ماجستیر) بغداد ١٩٩٥، ص٤٢٧.
(١٤) کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی موسڵ، ل٢٥.
(١٥) د. کمال مەزهەر، کۆمەڵەی گەلان، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٧)، ل١٣.

بوون، بۆیە بێجگە لە شاندی کوردی کە دەبوو رێ ی پێدرابا بەشداری ئەو کۆنگرەیە بکات چونکە هەر چ نەبێ یەکێ لە تەوەرەکانی کۆنگرەی قاهیرە لە کۆنفرانسی ئاشتی لە سیڤەر بەڵێنی بە کورد دابوو کە دەولەتێکی کوردی بۆ دابمەزرێنێ، بەڵام ئینگلیز تەنیا رێ ی بە شاندی عێراق دا کە عەرەب و ئینگلیزەکان بوون بەشداری لەو کۆنگرەیە بکەن، ئەوانیش ئەمانە بوون:

١- پێرسی کۆکس کۆمیسیاری باڵای ئینگلیز لە بەغدا.
٢- جەعفەر عەسکەری وەزیری بەرگری نیشتمانی عێراق[١٦].
٣- ساسۆن عسقێل وەزیری دارایی.
٤- ئیلمەر هۆلدن سەرکردەی هێزەکانی بەریتانی لە عێراق.
٥- سلێترۆ ئانکنسن راوێژکاری وەزارەتی دارایی و ئیشغال.
٦- میجەر ئیدی راوێژکاری وەزارەتی بەرگری بە وەکالەت.
٧- خاتوو گیرترود بێل ئەمینداری کۆمیسیاری باڵا[١٧].

بوونی سوپای ئینگلیز لە عێراق و کوردستان سەر ئێشەیەکی ماددی گەورەی بۆ بەریتانیا دروست کردبوو، هەربۆیە داوا دەکرا کە سوپا لە ناوچەکەدا بکێشێدرێتەوە[١٨] و سوپایەکی عێراقی دروست بکرێ،

(١٦) هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن کە جەعفەر عەسکەری بەرەگەز کورد بوویە، بەڵام خۆی نوێنەری کورد نەبوو، بەڵکو لەگەڵ شاندی عێراق دابوو.
(١٧) محمد شاكر، التاريخ الاسلامي: التاريخ المعاصر: بلاد العراق ١٩٢٤-١٩٩١، بيروت ١٩٩٢، ص٤٨.
(١٨) براوانە: د. عزيز الحاج، القضية الكردية في العشرينات، بغداد ١٩٨٥، ص٤٣.

ئینگلیزیش تەنها چاودێری ئەو سوپایە بکات. سەبارەت بە دیارکردنی پاشایەک بۆ عێراق هەرچەند میر فەیسەل کە لە سوریا تەختی کەوتبووە لێـژی بەهۆی سوپای فەرەنسی یەوە، لە عێراقدا لایەنگری هەبوو، هەروەها ئینگلیز پالپشتی دەکرد، بەلام هەر تەنها میر فەیسەل بۆ پاشایەتی عێراق دیارنەکرابوو بەلکو ئەوانەش خۆیان پالاوت بوو: عەبدولرەحمان گەیلانی نەقیبی پیاوماقولانی بەغدا، طالب پاشا نەقیبی پیاوماقولانی بەسرا، میر برهان الدین کوڕی سولتان عەبدولحەمیدی دووەم، ئاغا خان زەعیمی ئیسماعیلیەکان لە هیند، هەروەها شێخ خزعل میری موحەمەرە[19]. هەر کە سیاسەتی ئینگلیز میر فەیسەلی بە پەسەند زانی، ئەوا ویلسنیش لە کتێبەکەیدا دەنووسێ. بەپێچەوانەی ویست و ئارەزووی گەلی کوردەوە پرنس فەیسەلم کردە شای عێراق[20]. ئینگلیز بۆ ئەوەی مەسەلەی بە پاشاکردنی فەیسەل، قالبێکی مللی پێ بدات، مەسەلەکەی بەشێوەی دەنگدان خستەروو سەبارەت بە کوردەوە، خەلکی سلێمانی باوەڕیان وا بوو کە ئەمە خۆی لە خۆیدا پەشیمان بوونەوە لە سیڤەر دەگەیەنێ هەربۆیە وایان بە چاک زانی ناوچەکەیان لەژێر دەسەلاتی ئینگلیز دابێ نەک بەشێ بێ لە حکومەتێکی عێراقی[21]، خۆی هەرواش بوو، چونکە ئینگلیز بەر لە بەستنی کۆنگرەی قاهیرە بریاری دابوو کە **پەیمانی سیڤەر (ئەو بەندانەی سەبارەت بە کوردەوەن هەموار بکرێن و**

---

(19) ابراهيم خليل، سەرچاوەی پێشوو، ص٤٤٥.
(20) د. عەزیز شەمزین، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦١.
(21) براونە: د. عەزیز شەمزینی؛ د. عەزیز الحاج، هەروەها د. فاضل حسین.

والیٚ بکرێن دەگەڵ قوتاغەکە بکوێجێن)[٢٢] لە کەرکوکیش بیست مەزبەتە دەنگی یان بە فەیسەل دا بەڵام بیست و یەک مەزبەتە دژی بوون[٢٣] ئەمە و کوردەکانی کەرکوک لەگەڵ ئەوە بوون کە حکومەتێکی کوردی دابمەزرێ هەرچی هەردوو لیوای موسڵ و هەولێر بوون ئەوا بەمەرج دەنگی یان بە فەیسەل دا، مەرجەکانیش پاراستنی مافی کورد و کەمینەکان بوون[٢٤]. هەروەها، بەهۆی بوونی کەمالی یەکان لەناوچەکەدا ئەوا قەزاکانی رەواندوز و رانیە بەشداری ئەو دەنگدانەیان نەکرد[٢٥].

پاش ئەوەی لە ٩٦٪ دەنگەکان بەپاشایەتی فەیسەل رازی بوون، لۆرانسی عەرەب بە فەیسەلی راگەیاند کە ئەو دەبێ بە پاشای عێراق، بۆیە میر فەیسەل بە پاپۆری بەریتانی «نۆرث بروک» لە ١٩٢١/٦/٢٣ گەیشتە بەسرا و لە ١٩٢١/٦/٢٩ گەیشتە بەغدا و لە ١٩٢١/٧/٥ ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق دەنگیان بە میر فەیسەل دا[٢٦] هەروەها پاش ئەوەی میر فەیسەل رازی بوو کە عێراق ببێ بە حکومەتێکی نیابی دیموکراتی و دەستووری، ئەوا لە ٢٣/ئاب تاجی پاشایەتی لە شایلوغانێکی رەسمی دا لەسەری میر فەیسەل نرا و ئاکام عێراق بوو بە دەولەتێکی مەلیکی. لە رێگای بەڵگەمانە نهێنی یەکانی بەریتانی دا بۆمان دەردەکەوێ، کە ئینگلیز لە پەیمانی سیڤەر پەشیمان بۆتەوە، ئەوسا

---

(٢٢) ولید حمدي، الکرد والکردستان في الوثائق البریطانیة، لندن ١٩٩١، ص١١٨.
(٢٣) ابراهیم خلیل، سەرچاوەی پیشوو، ل٤٥٠.
(٢٤) سەرچاوەی پیشوو، ل٤٥٠. هەروەها براوانە د. فاضل حسین، ل٢٠.
(٢٥) سەرچاوەی پیشوو، ل٤٥١.
(٢٦) محمد شاکر، سەرچاوەی پێشوو، ص٤٩-٥٠.

باوەڕی وا بووە کە دەولەتێکی کوردی سەربەخۆ لە کوردستانی خوارووی دانەمەزرێ. لەمەشدا وەک سێر پیرسی کۆکس دەڵێ لە کۆنفرانسی قاهیرەدا دوو باسی سیاسی دەربارەی کورد هاتبونە پێش:

یەک: ناوچە کوردییەکان ببەسرێن بە عێراقەوە و بەبەشێک لە حکومەتی عێراق بژمێرێن.

دوو: لایەنگری جیابوونەوە و سەربەخۆی کورد بکرێن[٢٧] و ڕوژاندنی مەسەلەی کورد لەو کۆنگرەیەدا دەگەڕێتەوە بۆ ڕەوشی سیاسی و عەسکەری ئەوسا. لە کاتی کۆنگرەی قاهیرەدا، بزاڤی کەمالی یەکان بەشێوەیەکی سیاسی و عەسکەری بوونی خۆیان سەپاندبوو، واچاوەڕێ دەکرا کە ئەوان ببنە بەدیلی حکومەتی ئەستەنبۆل هەروەها لە کوردستانی خوارووش، کە کەمالی یەکان بە بە شێکی وڵاتی خۆیان دەزانی[٢٨]، تورکەکان تا ڕادەیەکی زۆر کاریان لە کوردەکان کردبوو. ئەمەو کەمالی یەکان پەیمانی سیڤەریان بەسێدارەی تورکیا دەزانی، هەربۆیە بۆ دەستەمۆکردنی تورکەکانیش، ئینگلیز پێش کۆنفرانسی لۆزان مەسەلەی دەولەت بوونی کوردیان لە بیربردەوە. گرنگی ئینگلیز بەمەسەلەی کوردەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستی یەی کە ئینگلیز تەواو لەگەڵ عەرەبەکانیش ساخ نەبوون، بۆیە (بەس دەولەت نەبێ) ئینگلیز دەگەڵ ئەوە دابوو کە ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردەکانی کوردستانی خوارووی دابمەزرێ، بەڵام هەرچەندە کۆنگرەی قاهیرە بایەخی زۆری دا بەمەسەلەی کورد، بەڵام ئاڵ

(٢٧) طارق جامباز، چرچل و کورد و خوارووی کوردستان لە چەند دوکیومەنتێکی وەزارەتی دەرەوەی ئینگلستاندا، گۆڤاری کاروان، ژ (١٢) ل٢٢.
(٢٨) کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی موسڵ، ل٢٥.

و گۆڕێکی ئەوتۆ لە سیاسەتی ئینگلیز لەبەرامبەری ڕووی نەدا[٢٩]، ئەمەش پابەندبوو بە ڕەوشی ڕەوتی ڕوداوەکانی ناوچەکە. سێر پێرسی کۆکس لەگەڵ بێل لەو کەسانە بوون کە دەبێ ناوچە کوردییەکان بە عێراقەوە بلکێندرێن پاساوی سێر پێرسی کۆکس بۆ ئەو کردارە ئیمپیریالیەش ئەوە بوو:

یەک: ناوچە کوردییەکان تەواوکەری بەشی عێراق ن.

دوو: کوردەکان لە ناوخۆیان تەبانین و ناتوانن ببن بەیەک و داوای دەولەتێکی کوردی بکەن[٣٠].

ئەمەو وە نەبێ هەر هەموو بەرپرسانی ئینگلیز هەمان ڕای پیرسی کۆکسیان هەبوویێ، بەڵکو وەک لە بەڵگەنامەکاندا دەردەکەوێ لە کۆنگرەی قاهیرەدا مشت و مڕێکی زۆر لەسەر چارەنوسی مەسەلەی کورد لە کوردستانی خواروو دا لە نێوان بەرپرسانی ئینگلیز دا بەرپابووە. چەرچل کە خۆی سەرۆکی کۆنگرەی قاهیرە بوو دەگەڵ ئەوە نەبوو کە کوردستان بەشێوەیەکی موتلەقی بکەویتە دەست حکومەتی عێراقی عەرەبی یەوە هەروەها چەرچل باوەڕی وابوو کە چەند قەوارەیەکی کوردی سەربەخۆ لە عێراق لە ژێر چاودێری ئینگلیز دابمەزرێ. هەروەها چەرچل لەوەلامی کۆکس دا لە تێلیگرافی ژمارە (١٩٦)ی ڕۆژی ١٩٢١/٦/٢٤ دۆکیومێنتی ژمارە ٦٣٤٦و F.O،٣٧١ دەڵێ: ئێمە دەما نەوێ ناوچەیەکی غەیری عەرەب لە نێوانی تورکیا و عەرەبی

---

(٢٩) د. کەمال مەزهەر، سەرچاوەی پیشوو، ل١٣.
(٣٠) براونە: د. عزیز الحاج، ل٤٤؛ طارق جامباز، ل٢٣.

میسۆپۆتامیادا هەبێت[٣١] هەروەها چەرچل بەکۆکس دەڵێ: «سۆن» و «لۆنگریک» لەگەڵ ئەو بۆچوونەی مندان[٣٢] ئەمەو چەرچل پێ ی لەسەر ئەوە دادەگرت کە بۆ ئینگلیز وا باشە... ناوچە کوردییەکان لەژێر فەرماندەی ئەفسەرەکانی بەریتانیا بێ نەک هی عەرەب ئێمە ئەمانەوێ حکومەتێکی تەواو لە میسۆپۆتامیادا دروست بکەین بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو حکومەتە دروست کراوە پەل بهاوێژێ بۆ ئەو شوێن و ناوچانەی تر کە عەرەب نین[٣٣].

هەرچی مێجەر یۆنک بوو، ئەوا باوەڕی وابوو لە کاتی ریفراندوم بۆ بەپاشاکردنی فەیسەل و هەروەها دیارکردنی چارەنووسی کوردستانی خواروو بە عێراقەوە، ئەوا کوردەکان دەرفەتێکی باشیان لە پێشە بۆ ئەوەی چارەنوسی خۆیان دیاری بکەن[٣٤] هەرچی میجەر نوئیل بوو، ئەویش باوەڕی وابوو کە ناوچە کوردییەکان لە ژێر چاودێری ئەفسەرە بەریتانی یەکان بێ نەک هی عەرەب، بەڵام وا دیاربوو رایەکانی سێر پیرس کۆکس و مس بێل زیاتر لەبەرژەوەندی ئەوسای بەریتانیا بوون، بۆیە حکومەتی لەندەن هەتا لەو برگەیەی نیزامی ئینتدابیش پاشگەزبۆوەوە سەبارەت بە کوردستان. لەمەش زیاتر، دوای کۆنگرەی قاهیرە بەحوکمی ئەوەی زۆربەی هۆکارەکان وایان دەخواست کە کوردستان بە

(٣٢) سەرچاوەی پێشوو.
(٣٣) سەرچاوەی پێشوو.
(٣٤) هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان و دەولەتەکەی خوارووی کوردستان، هەروەها بروانە: طارق جامباز، د. عزیز الحاج، ابراهیم خلیل.

عـێـراقی عـەرەبی یەوە بلکێ، بۆیە لە ١٩٢٦/٧/١٨ بەرەسمی هێلی بروکسل بوو بەسنوری نێودەوڵەتی نێوان عـێـراق و تورکـیـا و پەیمانی سیڤەر و بریارەکانی قاهیرەش بوون بە بەشێک لە رابردوو لەمەش زیاتر ئینگلیز و فەرەنسا بەزەبری چەک شۆرشەکانی کوردستان کوژاندەوە.

* لە گۆڤاری دهۆک ژمارە (٨) بەڵاوبوویتەوە.

# بەشی شەشەم

## کاریگەری داگیرکردنی لەسەر کەسایەتی کوردی دا

لەپاش بەرەسمی لکاندنی باشوری کوردستان بە عێراقی عەرەبی یەوە، دەسەلاتی عەلمانی عەرەبی بە ئاراستەی زلهێزەکانی ئەوسا بەتایبەتی ئینگلیز خەریکی بە کۆلیناکردنی کەسایەتی کوردیش بوون. ئەو پرۆسیسە ئیمپریالی یەی دەسەلاتی عەرەبی لەهەمبەر کورددا وەک نەتەوەیەک و کوردستان وەک زێدێکی رەسەنی کوردی ببوو بەکارێکی کۆمەلکاری عەرەبی، چونکە هەموو حیزبە عەرەبی یەکانی ئەوسا دەولەتی عیراقیان بەدەولەتێکی شەرعی دەزانی لەمەش زیاتر کوردیان بە کەمایەتی یەکی نەتەوەیی دادەنا. هەروەک وتمان ئەو تێروانینە ئیمپریالی یەی دەسەلاتی عەرەبی، رۆژئاوا بە کارێکی شەرعی یان دەزانی. هەرچەندە سەرکردە کوردەکانی ئەوسا لە هەمبەر ئەو سیاسەتەی دەسەلاتی داگیرکاردا راپەرین، بەلام ناهاوسەنگی و نا بەرامبەری لەهەموو بوارێکدا نەیتوانی رەوشەکە بە بەرژەوەندی کورد بگۆرێ. رەوشی داگیرکردن عەقلیەتی ئەقلیمەتی بەسەر کورد دا سەپاند. ئەقلیمیەتی خێلەکی، دەرەبەگی، کەلتوری، سیاسی لەمپەرێکی توندیان لە بەرامبەر یەکگرتنی کۆمەلگەی کوردی دا دروست کرد. ئەوسا کۆمەلگەی

کوردەواری ئەگەر تەواو کۆمەڵگەیەکی دەرەبەگی و خێڵەکی نەبووبێ، ئەوا پرۆسەی داگیرکردن مەسەلەی بەرەو پێشڤەچوونی کومەڵگەی کوردەواری ئەگەر بەرەوا دواوە پاشیرەوی پێ نەکردبێ ئەوا لە هەوڵێکی یەکلاکەرەوە دابوو بۆ ئەوەی کۆمەڵگەی کورد لەو قۆناغەدا بنبەست ببێ. کۆبوونەوەی ئەو دوو فاکتەرە دەورێکی زۆر گرنگیان بینی لە بونیادنانی عەقلیەتێکی فکری ئەقلیمی، بەشێوازیکی تر، عەقلیەتی ئەقلیمی بوو بەستراتیژ دانی بە ئەمری واقیعی داگیرکردن نا. ئەو دان پێ نانە قۆناغ بە قوناغ، کەلتورێکی ئەقلیمیی دروست کرد.

کەلتور، بەتایبەتی کەلتوری گیانیی Spiritual Culture دەورێکی زۆر گرنگ دەگێرێ لە ژیانی کۆمەڵگەدا، چونکە کەلتور زادەی بیر و بۆچوون و بیر کردنەوەی کۆمەڵگە خۆیەتی، لیرەدا سەبارەت بە کۆمەلگەی کوردیەوە -کە کۆمەڵگەیەکی بێ دەسەلاتی داگیرکراوبووە بەواتای خاوەنی ئازادی و کەلتوری خۆی نەبووە، بۆیە داگیرکاران هەوڵیان داوە لە رێگای کەلتوری خۆیانەوە کەلتوری کوردی لە هەمبەر تاکی کورد کەم بکەن. لەمەشدا نابێ خۆهێشتنی کوردیش لەو بارەیەوە فەرامۆش بکەین. لەمدا دەفامرێتەوە کە کەلتور دەورێکی زۆر گرنگ دەگێرێ لە دیارکردنی سیماکانی کەسایەتی مرۆڤی کورد دا. بە حوکمی ئەوەی کورد خۆی لە هەموو بواریکەوە داگیرکراوە، بۆیە دەرفەتی ئەوەی نەبووە کەسایەتی خۆی لەناو کەلتوری خۆیدا بدۆزێتەوە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە کورد سەد لە سەد تەسلیمی واقیعی داگیرکردن بووە و هەموو کەلتوری داگیرکاری قەبول کردووە، بەڵکو رەوتی ململانێ کەی

گۆڕیوه له بریتی رزگاربوون، دروشمی ئاشتەوایی و تەبایی دەگەڵ واقیعی خۆیدا بەرز کردۆتەوه. ئەگەر عەقلیەتی عەشیرەتگەری دەوری خۆی بینیوەوه له پێکەیاندنی عەقلیەتی ئەقلیمی دا، ئەمەش دیاردەیەکی سروشتی یه، چونکه ئەو ڕەوشه دەرهاوێشتەی نێوەنده خێڵەکی یەکەیه، بەڵام بزاڤی رۆشنگەری مارکسیش -کەئەویش خاوەن بیرۆکەی ناو کۆیی کەلتوری یه- هاوشانی عەشیرەتگەری بەڵکو زیاتریش دەورێکی زۆر نیگەتیڤی بینیووه له زیاتر فۆرمەلەبوونی نەک هەر عەقلیەتی کەلتوری ناوکۆ، بەلکو عەقلیەتی سیاسی و فکریش. هەریەک له عەقلیەتی عەشیرەتگەری و رۆشنگەری مارکسی هەریەکەی بەجۆری راستەوخۆیان ناراستەوخۆ له راژەی پرۆسەی مانەوەی رەوشی داگیرکردن دابووینه. به حوکمی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەو دوو عەقلیەته بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ بەهۆی ململانێ ی بەردەوامیان لەمپەری زیاتریان له بەردەم یەکگرتن و یەکێتی کوردا خولقاندووه. سەبارەت به باشووری کوردستان ئەوا وێرای خێوی داگیرکردنی دەسەڵاتی عەسکەری عەرەبی، ئەو عەقلیەتانەش کاریگەرێکی زۆر سەلبی یان لەسەر کەسایەتی سایکۆلۆژی تاکی کورد دروست کردووه. بەوپێ یەش هەردوو فاکتەری دەرەکی و ناوخۆی داگیرکردن کەسایەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردیان تێکشکاندوه له ئاکامیش کەسایەتی نەتەوەیی کوردیی دووچاری هەرەس بووه!

جا بۆ ئەوەی کەسایەتی کوردی له دەسەڵاتی خێوی داگیرکردن رزگاربێ دەبێ کەسایەتی کوردی خۆی لەو هەموو هێزه سیاسی و سەربازی و

ئابوری و کـەلتـوریانە دابـبـڕێ کـە کـەلتـوری کـوردیان لە نـیـوّ بردووەو داگـیـرکـردووە. هەندێ نووسـەر بیـانەوێ و نەیانەوێ رۆلی ئیـمـپـریالی ڕۆژئاوا و دەسـەلاتـی عـەرەبی پەردەپۆش دەکـەن بەوەی وا پیـشنیـار دەکەن کـە کـورد لە دین و کـەلتـوری دینی دابـبـڕێ و جـاریکی تر بگـەڕیتـەوە بۆ دینی کۆنی. لەونێوەش دەسـەلاتی عـەرەبی دەکەنە پاساو وەک بلێ ی ئەو دەسەلاتە، دەسەلاتێکی دینی یە و لەسەر دین بناخەی داڕێژراوە. ئەمە بۆ هەر ئایدیۆلۆژیـایەک یان فـەلسـەفـەیەک پەسـەند و دروست بێ، ئەوا ئیسلام ئەو خێوە رەتدەکاتەوە، چونکە نە دینیکی لاهوتی و کەهەنوتی یە و نەدینکی عـەرەبی یە هەتا ناسـیـۆنالیـسـتی عـەرەبی بە مۆلکی خـودی خۆی بزانێ و لە ژێر سێبەریدا کورد هەم شۆلدەر و هەم پاشکۆبێ!!

# ناوەڕۆک